چاپی چواردەم

بەشێک لە پەیامەکانی نوور

# پەیامی بیماران

بەدیعوززەمان

سەعیدی نوورسی

دایناوە

فارووق ڕەسووڵ یەحیا

کردوویە بە کوردی

بەشێك لە پەیامەكانی نوور

# پەیامی بیماران

بەدیعوززەمان

سەعیدی نوورسی

دایناوە

فارووق ڕەسووڵ یەحیا

كردوویە بە كوردی

# پێشەکیی وەرگێڕ

پەڕاو زۆر دانراوە و دادەنرێ، بە هەموو زمانەکان، دەربارەی چارەسەری نەخۆشی و گیروگرفتەکانی "دەروون" و "کۆمەڵ".. بەڵام جیاوازییەکی ئاشکرا هەیە لە نێوان دوو جۆر پەڕاودا:

جۆرێکیان: ڕاستەوخۆ چارەسەرەکانی پێشکەش دەکات، بێ ئەوەی لە پێشدا بزانرێ ڕادەی سەرکەوتنی لەم هەنگاوەدا چەندەیە.

جۆرێکی تر: دوای بەکارهێنان و تاقیکردنەوە و دەرکەوتنی کاریگەرییەکانی، خاوەنەکەی - لە ڕوانگەی دڵسۆزییەوە - بڵاوی دەکاتەوە.. وەك ئەو پزیشکەی کە هیچ دەرمانێك بۆ نەخۆشەکانی دیاری ناکات هەتا بە تەواوی دڵنیا نەبێت لەوەی دەرمانەکانی کاریگەرن.

مامۆستا نوورسی - خوا لێی خۆش بێت - کتێبەکانی (پەیامەکانی) لە جۆری دووهەم دەداتە قەڵەم. پەیتا پەیتا دووپاتی دەکاتەوە کە ئەو پەیامانەی نووسیونی بریتین لە چارەسەری مەعنەوی بۆ زام و برینەکانی دڵ و دەروونی مرۆڤەکان. دەشڵێ: "ئەم دەرمانانە مەڵحەمێکن نەخۆشییەکانی منی چارەسەر کرد، خۆ نەخۆشییەکانی تۆش لەوانەی من بەسۆتر نین"! وەك ئەڵێ: "هەرکەسێ هەیت ببە.. نە دەروونی تۆ لە هی من سەرکەشترە و، نە شەیتانەکەشت لەوەی من یاخی ترە. خۆ پەیامەکانی نوور هەردوکیانی لەغاو کرد و زامەکانیشی بۆ سارێژ کردم".

لە ڕاستیدا مرۆڤی ئەم چەرخە بە هیوای دەستکەوتنی ئاسوودەیی دەروون و بەختیاریی ژیان، هەوڵ و تەقالای زۆری داوە، ئنجا دوای تاقیکردنەوە و نەگەشتن

بە ئامانج، ماندوویەتی بە تەواوی تەنگی پێ هەڵچنیوە. پەیامەکانی نووریش - کە تیشکێکن لە تیشکەکانی خۆری درەخشانی قورئانی پیرۆز - دێن و مەڵحەمی سارێژکار بەو دەروونە هەڵقرچاوانە دەبەخشن و، دەستێکی ناسکی میهرەبان بەسەر ئەو دڵە ماندووبوانەدا دەهێنن و ئارەقی ناوچاوانیان دەسڕنەوە.

ئەمە بە گشتی دەربارەی ڕۆڵی تاقیکراوە و کاریگەری پەیامەکانی نوور لە بواری چارەسەری نەخۆشی و گیروگرفتەکانی "دەروون" و "کۆمەڵ".

پەیامی بیمارانیش - کە یەکێکە لەو پەیامانە - بە تایبەتی ئەرکی چارەسەر کردنی نەخۆش و دڵدانەوەی بیمارانی گرتووەتە ئەستۆ. چونکە مامۆستا نوورسی بەشێکی زۆری تەمەنی بە نەخۆشی بردووەتە سەر، هەروەك چەندین جاریش ژەهری دەرخوارد دراوە و، ئەو دەرمانانەی لە خۆیدا بەکارهێناوە کە لەم پەیامەدا لێیان دواوە. ئنجا دوای متمانە و قەناعەتی تەواو بە کاریگەریی چارەسەرەکانی بڵاوی کردوونەتەوە.

لە لایەکی تریشەوە ئەگەر سەرنج لە ڕێ و شوێنی دڵدانەوەی بیماران و دەردەدارانی گرۆی مرۆڤایەتی بدەین - کە وەك مامۆستا نوورسی دەڵێت: "یەك لە دەی بەشەکانی ئادەمیزاد پێکدەهێنن" - لە جیهانی کتێب و بڵاوکراوەکاندا، دەبینین ئەم لایەنە بایەخی شایانی پێ نەدراوە، بەڵکو هەر بایەخێکی ئەوتۆ بەدی ناکەین گەر بەراوردی بکەین لەگەڵ ئەو بایەخەی بە لەشساغان دەدرێ! کەچی مامۆستا نوورسی ئەم لایەنەی پشتگوێ نەخستووە و، ئەو دڵدانەوە ئومێد بەخشانەی خستووەتە بەردەست بیماران کە لە سەرچاوە ڕوونەکەی قورئان و ئیمان هەڵقوڵاون.

فاروق ڕەسووڵ یەحیا

# پەیامی بیماران

## بریتی‌یە لە بیست و پێنج دەرمان

**ئەم پەیامە: مەرهەم و دڵدانەوە و عەیادەت و ڕەچەتەیەکی مەعنەوی‌یە بۆ نەخۆشەکان و، لە ڕوانگەی ئەو وتەیەوە نووسراوە کە دەڵێت: "سوپاس بۆ خوا لەسەر چاکبوونەوەت و، خوا ئازارەکانت بکات بە کەفارەت".**

### ئاگاداری و پۆزش

ئەم دەرمان و ڕەچەتە مەعنەوی‌یەم لە هەموو نووسراوەکانی تر بە خێرایی و پەلەتر نووسیوە و[1] لەبەر کەمیی کاتیش پێداچوونەوە و پوختکردنیشی - وەك دانانی- بە پەلە بوو. لەبەر ئەوە، تەنها چاوێکم پێدا خشاند و، وەك ڕەشنووسەکەی ئاڵۆز دەرچوو. بە پێویستیشمان نەزانی ساغکردنەوە و پێداچوونەوەی نوێی تێدا بکەین، چونکە ئەو وتانەی کە بە شێوەیەکی "سروشتی" بۆ "دڵ" دێن نابێت بە قسەی ڕازاوە و هونەر و وردەکاری دەستکاری بکرێن. بۆیە تکا لە خوێنەران بە گشتی و لە بیماران بە تایبەتی دەکەم کە دڵگران و بێزار نەبن لەو ڕستە گرانانەی دەیانبینن و لەو دەستەواژانەی لە گەڵیاندا ڕانەهاتوون. هیواداریشم لە پاشملە دوعای خێرم بۆ بکەن.

**سەعیدی نوورسی**

---

(١) بەڵێ، ئێمە شایەتی دەدەین کە ئەم پەیامە لە ماوەی چوار سەعات و نیودا دانراوە. (ڕوشدی، ڕەئفەت، خەسرەو، سەعید) – دانەر

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿الَّذِينَ إِذا أَصَابَتْهُمْ مُصِيبَةٌ قَالُوا إِنَّا للهِ وإِنَّا إِليه راجِعون﴾ (البقرة:١٦٥)

﴿والَّذي هُوَ يُطْعِمُنِي ويَسقِينِ ۞ وإِذا مَرِضْتُ فهو يَشْفِين﴾ (الشعراء:٧٩-٨٠)

(لەم بریسکەیەدا بیست و پێنج دەرمان بە کورتی باس دەکەین، لەو دەرمانانەی کە دەگونجێ ببنە دڵدانەوەیەکی ڕاستەقینە و مەرهەمێکی سوودبەخش و سارێژکار بۆ خاوەن بەڵا و موسیبەت و نەخۆش و دەردەداران، کە یەك لە دەی بەشەکانی گرۆی ئادەمیزاد پێکدەهێنن).

## دەرمانی یەکەم

ئەی نەخۆشی داماو!

ئارام بگرە و دڵتەنگ مەبە. نەخۆشی‌یەکەت هەرگیز بە دەرد مەزانە! بەڵکو لە ڕاستیدا جۆرە دەرمانێکی تایبەتی‌یە. چونکە دەسمایەی تەمەن بەرەو نەمان دەڕوات، جا ئەگەر ئەم دەسمایەیە نەخرێتە کار و بەرهەم نەبەخشێت، خۆیشی تیادەچێت و دەڕوات. بە تایبەتی گەر ئەم تەمەنە بە حەوانەوە و بێ ئاگایی لە مرۆڤ بڕواتەسەر.

خۆ "نەخۆشی" دەبێتە هۆی دەستکەوتنی قازانجێکی زۆری ئەو دەسمایەیە و نایەڵێت تەمەن بە خۆڕایی و خێرایی لەدەست دەربچێت. بەڵکو هەنگاوەکانی تەمەن خاو دەکاتەوە و ماوەکەشی درێژە پێ دەدات و

بەروبوومی پێ دەبەخشێت، ئنجا ماڵئاوایی دەکات. بۆیە ئەم ڕاستی‌یە دەماودەمی پێ کراوە و وتراوە:

"ژیانی پڕ لە دەردیسەری چەندە درێژە و، ژیانی خۆشی و ڕابواردنیش چەندە کورت و کەمخایەنە"!

## دەرمانی دووهەم

ئەی نەخۆشی ئارام لابڕاو!

کاڵای ئارام بە بەرت ببڕە و بە شوکرانەکردن خۆت بڕازێنەرەوە. ئەوەش بزانە کە ئەم نەخۆشی‌یەت دەتوانێت هەموو خولەکێکی ژیانت بکات بە سەعاتێك عیبادەت و پەرستش. چونکە پەرستش دوو جۆرە:

یەکەم: پەرستشی ئیجابی و ڕاستەوخۆ، کە لە نوێژ و پاڕانەوە و جۆرەکانی تری وەك ئەواندا دەردەکەوێت.

دووهەم: ئەو پەرستشە سەلبی‌یەیە کە مرۆڤ لە دەمی ناخۆشی و کاتی بەڵادا بە دڵێکی بەکوڵ و پڕ لە خشووعەوە پەنا دەباتە بەر بەدیهێنەری میهرەبانی خۆی و، بە هەست کردنی بە "لاوازی" و "دەستەوسانی"ی خۆی لە ناخی دڵەوە لێی دەپاڕێتەوە. بەم جۆرە، خاوێنترین پەرستشی مەعنەوی دەردەبڕێت بەرامبەر خوای خۆی، لەبەر دووربوونی ئەو پەرستشە لە هەموو جۆرێکی ڕیا و خۆدەرخستنەوە.

بەڵێ، چەندین "ڕیوایەتی صەحیح" هەن ڕوونی دەکەنەوە کە ئەو تەمەنەی لەگەڵ بەڵا و نەخۆشیدا تێپەڵکێشە، بە مەرجی ناشکوری و سکاڵا نەکردن و ئومێد نەبرین لە میهرەبانی و بەزەیی خوا، بە پەرستش دەژمێررێت[١].

---

(١) قال رسول الله ﷺ: "إذا ابتلى الله العبد المسلم ببلاء في جسده، قال الله عزّ وجل: اكتب له صالح عمله، فإن شفاه غسّله وطهّره، وإن قبضه غفر له ورحمه". حديث حسن، رواه أحمد.

تەنانەت لە چەند ڕیوایەتێکی صەحیح و "کەشف"ی ڕاستی پیاوچاکانەوە دەرکەوتووە کە هەر خولەکێکی ژیانی هەندێ لە نەخۆشە ئارامگرە شوکرانە بژێرەکان بە سەعاتێکی تەواوی "خواپەرستی" دادەنرێت!

کەواتە هەرگیز وەڕس مەبە و ناشکوری لەدەست نەخۆشی‌یەك دەرمەبڕە کە بەهۆیەوە خولەکێکی پڕ ئازار و ستەمی ژیانت بە هەزار خولەك بۆ بنووسرێت، بەڵکو بە دڵ و زمان شوکری خوای گەورە بکە.

## دەرمانی سێهەم

ئەی ئەو نەخۆشەی توانای نەخۆشیی نی‌یە!

باش بزانە کە هاتنە دنیای مرۆڤ بۆ ڕابواردن نی‌یە..

باشترین بەڵگەش ئەوەیە کە هەرکەسێك دێت، دەڕوات و.. هەموو لاوی‌یەك، پیریی لە دوایە و.. هەموانیش لە لێژایی بەرەو نەمان و جودایی، خل دەبنەوە!

لە کاتێکدا کە مرۆڤ لە هەموو ڕوویەکەوە ڕێکوپێکترین و بەرزترینی زیندەوەرانە، تەنانەت پادشای هەموویانە، کەچی بە دەستی خۆی قورسترین جۆری بەڵا و ناخۆشی بەسەر خۆیدا دەهێنێت کاتێ بیر لە چێژ و لەزەتەکانی ژیانی ڕابوردووی و، ترس و لەرزی ڕۆژانی داهاتووی دەکاتەوە. بەو جۆرە، لەسەر لوتکەی پلەی مروڤایەتی‌یەوە خۆی دەخاتە خوارەوە بۆ چەند پلەیەکی لە هی ئاژەڵ نزمتر!

---

(صحیح الجامع الصغیر وزیادته ٢٥٦) الأدواء ٥٥٣. واتە: هەرکات خوای گەورە بەندەیەکی خۆی بە بەڵایەك لە جەستەیدا گیرۆدە بکات، دەفەرموێ: کردەوە باشەکانی لەسەر تۆمار دەکەم. جا ئەگەر شیفای پێ بەخشێت ئەوا لە گوناهەکانی پاکی کردووەتەوە و، ئەگەر بیشی باتەوە بۆ لای خۆی ئەوا لێی خۆش دەبێت و ڕەحمی پێ دەکات. (وەرگێڕ)

کەواتە مرۆڤ بۆ ئەوە نەهاتووەتە دنیا کە ژیانێکی ئاسوودە و نەرمونیانی تێدا بباتەسەر، ژیانێکی وا کە لە هەموو لایەکەوە سروەی حەوانەوە و خۆشگوزەرانیی بەسەردا هەڵبکات. بەڵکو کاتێ هاتووەتە ئەم دنیایە، دەسمایەیەکی پێ دراوە کە بتوانێت ژیانێکی نەبڕاوەی خۆشی هەتاهەتایی پێ دەستەبەر بکات. بۆ ئەم مەبەستەش چەندین ڕێی بازرگانیی بۆ ئاسان کراوە.

جا ئەگەر نەخۆشی نەبێت، ئەوا بەهۆی تەندروستی و خۆشحاڵییەوە مرۆڤ لە خوای گەورە بێ ئاگا دەبێت و، جیهان لە بەرچاویدا ڕازاوە و بەتام دەردەکەوێت و دڵی بە لایەوە دەمێنێت. دیارە ئەو کاتەش تووشی نەخۆشیی: "لە یاد کردنی ڕۆژی دوایی" دەبێت و حەز بە یادی مردن و مانەوەی ناو گۆڕ ناکات و، تەمەنە شیرینەکەی - کە دەسمایەی ژیانیەتی - بە خۆڕایی لەدەست دەدات. بەڵام نەخۆشی لە خەوی بێ ئاگایی چاوی پێ دەکاتەوە و پێی دەڵێت:

(تۆ مردنت لە ڕێدایە و هەرگیز جڵەوت بۆ شل نەکراوە، بەڵکو ئەرك و فەرمانبەرییەکت خراوەتە ئەستۆ. کەواتە لە خۆت بایی مەبە و یادی خواوەندی بەدیهێنەرت بکەرەوە. ئەوەش بزانە کە تۆ بەرەو دەرگای گۆڕەکەت هەنگاو دەنێیت. کەواتە هەر لە ئێستاوە خۆتی بۆ ئامادە بکە)!

لەم ڕوانگەیەوە، نەخۆشی ڕۆڵی مامۆستایەکی دڵسۆز و ڕابەرێکی لێهاتوو دەبینێت..

کەواتە سکاڵای لەدەست مەکە! بەڵکو پێویستە بەرەو سێبەری حەوێنەری شوکرانە کردن هەنگاو بنێیت.

خۆ ئەگەر نەخۆشی تەنگی پێ هەڵچنییت، ئەوا هانا بۆ خوای گەورە بەرە و، توانای ئارام و خۆڕاگریی لێ داوا بکە!

## دەرمانی چوارەم

ئەی نەخۆشی سکالاٚکەر!

بزانە کە تۆ مافی سکالاٚنت نیـیە! بەڵکو پێویستە شوکرانەبژێر بیت و ئارام بگریت. چونکە خۆت و بوون و ئەندامەکانت هیچیان هی خۆت نین، ئەوەتا بۆ خۆت دروستت نەکردوون و لە هیچ کارگە و کۆمپانیایەکیش نەتکڕیون. کەواتە موڵکی یەکێکی ترن و، ئەویش بەپێی ویستی خۆی لە موڵکی خۆیدا ڕەفتار دەکات. هەروەك لە نموونەیەکی "وتەی بیست و شەشەم"دا وتراوە:

خاوەن کارگەیەکی دەوڵەمەند دەیەوێت نموونە و مۆدێلی تازەی چەند جۆرە بەرگێك بخاتە پێش چاوی خەڵکی و، لەم ڕێیەوە لێهاتوویی خۆی و پێشکەوتنی کارگەکەی دەربخات. بۆ ئەم مەبەستە پیاوێکی هەژار دەگرێت بەکرێ و ئەو بەرگانەی دەکاتە بەر، تاکو بینەرانی پیشانگاکەی سەیری بکەن و لێهاتوویی و زانست و هونەری وەستای خاوەن کارگەکەیان بۆ دەربکەوێت. لێرەدا خاوەن کارگەکە داوا لەو پیاوە کرێگرتەیە دەکات کە بەو بەرگانەوە بە هەموو شێوەکانی وەستان و دانیشتن خۆی پیشانی ئامادەبووان و بینەران بدات. پاشان تاوێك بەرگێکی درێژ و تاوێك بەرگێکی کورتی دەکردە بەر و، تاوێکی تر لە بەرگەکەی بەری دەبڕی و تاوێکی تر کورتی دەکردەوە... هتد. بەم شێوەیە و بۆ ئەو مەبەستەی باسمان کرد، هەموو جۆرەکانی مۆدێلی تازەی پێ لەبەر دەکات..

جا ئایا ئەو کرێکارە هەژارە مافی ئەوەی هەیە بڵێت:

(تۆ بەم هەڵسان و دانیشتن و گۆڕین و کورتکردنەوە و درێژکردنەی بەرگەکەی بەرم ئازاری من دەدەیت)؟

یان بڵێت:

(بـە کورتکردنـەوە و درێژکردنـی ئـەو بەرگـەی بـەرم، جوانیيەکـەی ناهێڵیت و منیشی پێوە ناشیرین دەردەخەیت. تۆ بەم ڕەفتارەت بێ ویژدانـی و ستەمم لەگەڵ دەنوێنیت)؟!

بە هەمان جۆر، بەدیهێنەر و خوای پەروەردگاریش – ولله المَثَلُ الأعلى – کە بەرگی جەستەی لەبەر کردوویـت و، ئەو پۆشـاکەی بـە چـەند هەستێکی تیشکدار و ڕووناکی وەك ژیری و چاو و گوێ و... هتد، ڕازاندووەتەوە..

ئەو خوایە، دەیەوێ نەخشە ڕەنگینەکانی ناوە جوانەکانی خۆی بە هـەموو شێوەیەك لە پیشانگای بوونەوەردا دەربخات..

هـەروەك بـەهۆی برسێتیيەوە لـە نـاوی "الـرزاق"ی خـوا تێدەگـەیت و "ڕەززاقییەت"ی ئەوت بۆ دەردەکەوێت..

بە هـەمان جۆر لـە ڕێگـای "نەخۆشی"یـەوە نـاوی "الشـافي"ی ئـەوت بـۆ دەردەکەوێت و لێی تێدەگەیت.

جا لەبەر ئەوەی هەندێ لە ناوە جوانـەکانی خـوای گـەورە بـەهۆی بـەڵا و ناخۆشـی و گیروگرفتەکانەوە دەردەکـەون، ئـەوا ئـەو بـەڵا و ناخۆشـیيانە ڕووناکیی جوانیی کارەکانی خوایان تێدایە، کە تیشکی دانست و بریسکەی بەزەیی ئەویان لـێ دەدرەوشێتەوە.

ئەگـەر پەردە لـە بـەردەم چاوەکـانتدا لابدرێـت و بـۆ دیـوی پشـتەوەی نەخۆشـیيەکەت بڕوانیت – ئـەو نەخۆشـیيەی کـە بـێزاری کردوویـت – دەبینیت کە چەندین واتای ڕەنگین و دانستی جوان، لەوانەی کە دڵـت پێیـان دەکرێتەوە، لـە پشت پەردەی نەخۆشیيەکەتەوە خۆیان حەشار داوە و، هـانت دەدەن کە بیانپشکنیت و پەردە لە ڕوویان هەڵبماڵیت!

## دەرمانی پێنجەم

ئەی ئەو کەسەی بەدەست نەخۆشی‌یەوە گیری خواردووە!

من بەش بە حالی خۆم و لە ڕێی تاقیکردنەوەی تایبەتیی خۆمەوە لەم ڕۆژگارەدا، دڵنیایی تەواوم بۆ پەیدا بووە کە نەخۆشی بۆ هەندێ کەس چاکە و بەخششی خوای گەورەیە کە بە میهرەبانیی خۆی بۆیان دەنێرێت[1]!

لە ماوەی ئەم هەشت نۆ ساڵەدا چەند لاوێکی نەخۆش هاتن بۆ لام بۆ ئەوەی دوعایان بۆ بکەم - هەرچەندەش من شایستەی ئەوە نیم - منیش بۆم دەرکەوت کە ئەوانەیان ئازاریان زۆرترە، یادی ڕۆژی دواییان زیاترە و بێ ئاگایی لاوی‌یان تێدا نی‌یە و، تا ڕادەیەکیش لە ژێر کۆڵی قورسی نەخۆشیدا خۆیان لە ڕابواردن و حەز و ئارەزووی ئاژەڵانە دەپارێزن.

منیش یادم دەخستنەوە کە: هەتا زیاتر ئارامگر بن لە بەردەم ئازاری نەخۆشیدا، ئەوا نەخۆشی‌یەکەیان بە دیاریی میهرەبانیی خوای گەورە دادەنرێت.

هەروەها پێم دەوتن:

(کاکی خۆم!

من دژی ئەم ئازارەی تۆ نیم. هەر لەبەر ئەوەشە کە بەزەییم بە تۆدا نایەتەوە و بۆت ناپارێمەوە! بەڵام ئەوەندەت پێ دەڵێم: هەوڵ بدە بە شێوەیەکی جوان و ڕەنگین کاڵای ئارامگرتن بە بەرت بېڕیت و لە بەردەم

---

(١) عن أبي هريرة رضي الله عنه أن النبي ﷺ قال: "مَن يرد الله به خيراً يُصب منه". رواه البخاري ومالك. واتە: خوای گەورە نیازی خێری بە هەر کەسێك بێت دووچاری گیروگرفتی دەکات. (وەرگێڕ)

ئازاری نەخۆشیدا خۆت ڕابگریت هەتا چاك دەبیتەوە. چونكە بەدیهێنەری میهرەبان، هەر كاتێ ویستی لەسەری بێت و دوای ئەوەی نەخۆشی‌یەكەت ئەو كار و ئەركەی پێی سپێرراوە لە تۆدا بە ئەنجامی گەیاند، چاكت دەكاتەوە و شیفات پێ دەبەخشێت).

هەروەها دەم وت:

(هەندێ كەس لە هاوتەمەنانی تۆ، تەنها لەبەر ڕابواردنێكی بچووكی ساتێكی ئەم دنیایە، چوارچێوەی خانە و لانەی ژیانی هەتاهەتاییان دەڕووخێنن. ئەوانە لەبەر ڕۆچوونیان لە بێ ئاگاییدا و بەهۆی "بەڵای تەندروستی‌یەوە" وازیان لە نوێژ و یادی مردن و ڕۆژی دوایی هێناوە، تەنانەت هەر یادی خواش ناكەنەوە! بەڵام تۆ لە ڕوانگەی نەخۆشی‌یەكەتەوە، چاوت لەو گۆڕەیە كە خانووی تایبەتیی خۆتە و هەر دەبێ بڕۆیتە ناوی. هەروەها جێگاكانی تری دوای گۆڕیش دەبینیت. ئیتر تۆ بەپێی داخوازیی ئەم بینین و چاوپێكەوتنە كارەكانت جێبەجێ دەكەیت. كەواتە ئەم نەخۆشی‌یە بۆ تۆ تەندروستی‌یە و، تەندروستیش بۆ هەندێ كەس نەخۆشی‌یە)!

## دەرمانی شەشەم

ئەی ئەو نەخۆشەی كە لە ناو ئازاری نەخۆشی سكاڵا دەكات!

داوات لێ دەكەم یادێكی ڕۆژانی ڕابوردووی تەمەن و ژیانت بكەیتەوە. چ ئەو ڕۆژە بەتام و چێژانەی كە بە خۆشی بەسەرت بردوون و، چ ئەو ڕۆژانەی تەمەنیشت كە بە ئازار و ئەشكەنجەوە بەسەرچوون!

بێ گومان كە یادی ئەو ڕۆژانە دەكەیتەوە یەكسەر دەڵێی: "ئۆخەی"..
یان دەڵێی: "ئاخ بە داخەوە"!

سەرنج بدە لەوەی کە: ئێستا ڕۆژانی ئەشکەنجە و مەینەتیت هاتەوە یاد یەکسەر تامێکی نهێنیت چەشت و لە خۆشیدا شوکری خوات کرد و لەبەر ڕزگاربوونت لەو بەڵا و ناخۆشی‌یانەی ڕابوردوو، وتت: "شوکر و ستایش بۆ خوای گەورە". چونکە نەمان و لاچوونی هەر ئازارێك خۆشی و تامێکی شیرین و تایبەتی لە دەروونی مرۆڤدا بەجێ دەهێڵێت. ئەوەتا کە یادیان دەکەیتەوە ئەو شیرینی‌یە لە دڵ و دەروونت سەردەکات و ئنجا تۆش لەسەر زمانت بە شێوەی شوکر و ستایش دەری دەبڕیت!

بەڵام ئەو کاتە خۆشانەی کە لە ژیانتدا بەسەرچوون و بە یادکردنەوەیان خەم و خەفەت سەرت تێدەکات و دەڵێیت: "ئاخ و داخ بۆ ئەو ڕۆژگارانە"، ئێستا دوای بەسەرچوونیان ئازارێکی پەنهانی تایبەتی و بەردەوامیان لە دەروونتدا بەجێ هێشتووە و، بە یادکرنەوەشیان ئەو ئازارانە تازە دەبنەوە و بەخوڕ فرمێسکی داخ و حەسرەتیان بە دوادا هەڵدەڕێژیت!

جا مادەم خۆشی و لەزەتی ناڕەوای ماوەی تەنیا یەك ڕۆژ - هەندێ جار - ماوەی ساڵێکی ڕەبەق ئازار دەرخواردی مرۆڤ دەدات و، ئازاری نەخۆشی‌یەکی کورت و کەم خایەنیش لەزەتێکی پەنهان لە دڵی ئەودا بەجێ دەهێڵێت، بەهۆی ئەو پاداشتە خواییەی کە لەو ڕێیەوە دەستی دەکەوێت، وێڕای چێژ و لەزەتی مەعنەویی ڕزگاربوونیشی لەو ئازارانە..

ئەوا هەر ئێستا سەرنج لەو نەخۆشی‌یە کەم خایەنەی خۆت بدە کە ئازارت دەدات و، بیر لەو پاداشتە نەبڕاوە خواییەش بکەرەوە کە لە دووتوێی نەخۆشی‌یەکەتدایە و، لە شوکرانە بژێریی خواوەند دەرمەچۆ و، دەست لە سکاڵا کردن هەڵبگرە و، دڵی خۆت بدەرەوە و، بڵێ:

"هیچ ناخۆشی‌یەك تا سەر نابێت"!

## دەرمانی شەشەم[1]

ئەی برای نەخۆشی سەر لــێ شـێواو بـەهۆی یـاد کردنـەوەی چێـژ و لەزەتەکانی ژیانی ڕابوردووی دنیا!

ئەگەر ئەم دنیایە "هەمیشەیی" بوایە..

ئەگەر "مردن" لەسەر ڕێگامان بە تەواوی لابرایە..

ئەگەر ڕەشەبای نەمان و مردن لە هەڵکردن بکەوتایە..

ئەگەر ئایندەمان وەرزی سەرما و سۆڵەی زستانی لـێ بڕایە..

ئەو کاتە منیش دەهاتمە ڕیزی تۆوە و تێر بۆ حاڵی تۆ دەگریام!

بەڵام مادەم دنیا گوێی خۆی لە هاوار و ناڵەمان کەڕ دەکات و، دەست بە ڕوومانەوە دەنێت و، دەرمان دەکـات و، پێمـان دەڵێـت: "خۆتـان بپێچنـەوە و بڕۆن"! ئەوا دەبێ پێش ئەوەی دەرمان بکات ئێمە وازی لـێ بـهێنین و عیشـقی لە دڵمان دەربکەین و دەستمان لـە داوێنی بـەر بدەیـن. باشــترین هـەلیش بـۆ ئەوەی کـە بە دڵ و دەروون دەستی لـێ هەڵبگرین - پێش ئەوەی ئـەو دەرمـان بکات - کاتی نەخۆشی‌یە! چونکە نەخۆشی مرۆڤ لـە خـەو هەڵدەسێنێت و بێداری دەکاتەوە!

بەڵێ، کە "نەخۆشی" ئـەم واتـا ورد و قووڵـەمان دەخاتـەوە یـاد، بـە گوێـی دڵماندا دەچرپێنێت و پێمان دەڵێت:

(ئـەی ئـادەمیزاد! جەستـەی تـۆ لـە پـۆڵا و ئاسـن نی‌یـە، بـەڵکو لــە چـەند ماددەیەکی جیاجیا پێکهاتووە کـە زۆر بـە ئاسـانی هەڵوەشـانەوە و لـەتبوون و

---

(١) لەبەر ئەوەی ئەم "بریسکە"یە بە شێوەیەکی "سروشتی" هاتە دڵمەوە، ئەوا لە پلەی شەشـەمدا دوو دەرمان نووسرا.. ئنجا لەبەر ئەوەش دەست لە شێوە "سروشتی"یەکەی نـەدەین، چۆن هـات بە دڵدا هەر وەهاش نووسیمان و، نەمانوێرا دەستکاریی بکەین، نەبادا "نهێنی"یەکی تێدا بێت. (دانەر)

تێکشکانی بەسەردا دێت. کەواتە لە خۆت بایی مەبە و فریای خۆت بکەوە و خاوەنی خۆت بناسە و بزانە چ ئەرکێکت پێ سپێرراوە. هەروەها تێبگە و بزانە حیکمەت و ئامانجی دروستبوون و هاتنە دنیات چی‌یە)؟!

ئنجا مادەم خۆشی و چێژ و لەزەتی دنیا - بە تایبەت ئەگەر ناڕەوا بێت - هەتا سەر نی‌یە و کۆتایی پێ دێت، تەنانەت ئازار و گوناهبارییش لە دڵی مرۆڤدا بەجێ دەهێڵێت، ئەوا بە بیانووی نەخۆشی‌یەکەتەوە بۆ لەدەست چوونی ئەو چێژ و لەزەتانە مەگری، بەڵکو بیر لە ناوەرۆك و واتا و پاداشتی دوارۆژی ئەو پەرستشە مەعنەوی‌یە بکەرەوە کە لە دوو توێی نەخۆشی‌یەکەتدایە و، هەوڵ بدە ئەم چێژ و لەزەتە خاوێنەت دەستگیر ببێت.

## دەرمانی حەوتەم

ئەی ئەو نەخۆشەی کە نیعمەتی تەندروستیی لەدەست داوە!

"نەخۆشی" تامی نیعمەتی تەندروستی لەناو نابات. بەڵکو بە پێچەوانەوە، نەخۆشی لەزەتی تەندروستیت پتر پێ دەچێژێت و بایەخدار و شیرینتری دەکات لە لات. چونکە هەرشتێك ئەگەر لەسەر حاڵی خۆی بمێنێتەوە و گۆڕانی بەسەردا نەیەت، ئەوا تام و لەزەتەکەی لەدەست دەدات. تەنانەت زانایان و حەقرەوان بە یەك دەنگ وتوویانە:

"هەموو شتێك بەهۆی دژەکەیەوە دەناسرێت"!

بۆ نموونە:

ئەگەر "تاریکی" نەبوایە "ڕووناکی" نەدەناسرا و هیچ تام و چێژێکی نەدەبوو..

ئەگەر "سەرما" نەبوایە نرخی "گەرما" نەدەزانرا و حەزی پێ نەدەکرا..

ئەگەر "برسێتی" نەبوایە "تام و لەزەت" لە خواردندا نەدەبوو..

ئەگەر "گەرمی"ی گەدە نەبوایە "لەزەتی ئاو خواردنەوە"مان نەدەچەشت..

ئەگەر "ئێش و ئازار" نەبوونایە نرخ و تامی "لەش ساغی"مان نەدەزانی..

ئەگەر "نەخۆشی" نەبوایە، بایەخمان بە "تەندروستی" نەدەدا و بێ تام دەبوو لە لامان.

خوای گەورەش، بۆ ئەوەی لە شوکرانەبژێریی دەرنەچین، ویستوویەتی تێمان بگەیەنێت کە چەندین جۆر چاکەی بەسەردا ڕژاندووین و، تامی چەندەها جۆری نیعمەتی بەرزیشی پێ چەشتووین.. بۆ ئەم مەبەستەش، گەلێ کۆئەندام و ئامێری زۆری پێ بەخشیوین کە بە هۆیانەوە هەست بەو نیعمەتە جۆراوجۆرانە بکەین. لەبەر ئەوە، پێویستە زام و ئازار و نەخۆشی پەیدا ببن و بێنە کایەوە، کتومت وەك ئەوەی کە خواوەند، بە لوتفی خۆی، نیعمەتی تەندروستیی پێ بەخشیوین و پێویستمان پێی دەبێت!

ئێستا دوای ئەم ڕوونکردنەوەیە.. ئەم پرسیارەت ئاراستە دەکەم و دەڵێم: گەر ئەو نەخۆشی‌یە نەبوایە کە ئێستا لە سەرت، یان دەستت، یان چاوت، یان لە گەدەتدایە، ئایا هەستت بەو نیعمەتی تەندروستی‌یە دەکرد کە سایەی بەسەر ئەو ئەندامەتدا ڕاکێشابوو؟ ئایا لەزەتی ئەو نیعمەتەت دەچەشت کە لەو تەندروستی‌یەدا هەبوو؟ پاشان ئایا شوکرانەت لەسەر پێشکەش دەکرد؟ یان لە بریی شوکرانە، لە یادت دەکرد؟! یاخود بەهۆی بێ ئاگاییەوە ئەو نیعمەتی تەندروستی‌یەت لە ڕێی خراپەکاری و نەفامیدا بەکار دەهێنا؟!

## دەرمانی هەشتەم

ئەی ئەو نەخۆشەی کە هەمیشە لە یادی دوارۆژیدایە!

کاریگەریی نەخۆشی‌یەکەت وەك هی سابوون وایە؛ چڵکی خەتاکاری و گوناهباریت دەشواتەوە و پاکی دەکاتەوە!

چونکە چەسپاوە کە نەخۆشی لابەر(کفارة)ی گوناهـ و بێ فـەرمانیی خوایە. ئەوەتا فـەرموودەیەکی صەحیح دەفـەرموێ:

"ما من مسلم يصيبه أذىً إلاّ حاتّ اللهُ عنه خطاياه كمـــا تحـــات ورق الشجر"[١].

چونکـە "گوناهبـاری" نەخۆشی هەمیشـەییە لـە ژیـانی هەتاهـەتایی ڕۆژی دواییـدا، هـەروەك لـەم ژیانـەی دنیاشـدا چەندین نەخۆشی لـە دڵ و گیـان و ویژدانی مرۆڤدا دروست دەکات.

جـا ئەگـەر لـەم نەخۆشیەدا ئارام بگریـت و سـکاڵا نەکـەیت، ئـەوا بـەم نەخۆشـیە کـەم خایـەن و بچووکـە خـۆت لـە چـەندین نەخۆشـیی زۆر و هەتاهەتایی دەرباز دەکەیت.

بەڵام ئەگەر گوێ نەدەیتە گوناهەکانت و، ڕۆژی دوایی بـە جارێ لـە یـاد بکەیت و لە پەروەردگاری خۆت بێ ئاگا بیت، ئەوا بە دڵنیاییەوە دەڵێـم کـە: تووشی نەخۆشیەکی هێندە قورس و گران دەبیت کـە یـەك ملیـۆن جـار لـەم نەخۆشـیە کاتیانـە گـەورەتر و بەسـۆ و ئـازارترە. کـەواتـە هـەر لـە ئێسـتاوە فریـای خـۆت بکـەوە و لـەدەسـت ئـەو نەخۆشـیە هـەڵبێ و تـا دەتوانیـت لێـی دوورە پەرێز بە.

سەختی و ئازاری زۆر و بەسۆی ئـەو نەخۆشـیەی باسمـان کـرد لەوەدایـە کـە دڵ و دەروون و گیـانت لـەم دنیایـەدا پـەیوەندیان بـە سەرانسـەری بوونـەوەرانی دنیـاوە هەیـە. خـۆ ئەگـەر لەسـەر ئـەم شێوەیە بمێنیتـەوە و فریـای خۆت نەکەویت و ڕۆژی دوایی بخەیتە لاوە، ئەوا هەمیشە ئەو پەیوەندیانەت

(١) رواه البخاري ومسلم. واتە: هەر موسڵمانێك هەر ئازارێکی تووش ببێت ئەوا خوای گەورە بەو ئازارە گوناهـەکانی لـێ هەڵئـەوەرێنێت وەك ئـەوەی درەخـت گـەڵاکانی لـێ ئەوەرێتـە خوارەوە. (وەرگێڕ)

بە شمشێری بڕندەی نەمان و جودایی لەت لەت دەبن و دەیان زام و برینی ئازاربەخش و قووڵ لە ناختدا دروست دەکەن. بە تایبەت کە تۆ – لەبەر بێ ئاگاییت لە ڕۆژی دوایی – وەك لەناودانێکی هەمیشەیی(إعدام أبــــدی) دەڕوانیتە "مردن" و بەم پێیە سامناك دێتە پێش چاوت! وەك بڵێی ئەو برین و ئازارانەی کە لە ناختدا دروست دەبن، دەتکەن بە جەستەیەکی نەخۆشی هێندە گەورە کە بە ئەندازەی هەموو دنیا بێت. دیارە ئەو کاتەش بە دوای چارەسەری ڕاستەقینەدا دەگەڕێیت بۆ زامەکانی ئەو جەستە مەعنەوییە نەخۆشەی گیان و دڵ و دەروونت کە چەندین برینی زۆریان تێدا پەیدا بووە و ئارامی لە لا هەڵگرتوویت. خۆ بێ گومان هیچ چارەیەکیشت بۆ ئەم مەبەستە دەست ناکەوێت جگە لە چارەسەری ئیمان و بڕوای ڕاستەقینە و مەرهەمی سارێژکاری بیروباوەڕ.

کورتترین ڕێگاش بۆ گەیشتن بەو چارەسەرە، ئەوەیە کە لە دەروازەی "هــەژاری" و "دەستەوەسانی"ی نــاو سروشـتی مرۆڤـەوە بڕوانیتـە نەخۆشییەکەت. دەرگـای ئەو دوانەش تەنها بەم نەخۆشییە ئاساییانە دەکرێتەوە کە پەردەی بێ ئاگایی لادەدەن و، مرۆڤ دەگەیەننە پلەی ناسینی توانست و میهرەبانیی فراوانی خواوەندی شکۆمەند.

بەڵێ، ئەو کەسەی خوا نەناسێت، بە ئەندازەی دنیا و هەرچیی تێدایە خەفەت و بەڵا و ناخۆشی لەسەر تەوقی سەری کۆ دەبێتەوە. بەڵام مرۆڤێك کە پەروەردگاری خۆی بناسێت، بەهۆی هێزی ئیمانەکەیەوە ئەم دنیایەی پڕ دەبێت لە ڕووناکی و دڵخۆشیی مەعنەوی. هەرکەسەش بە گوێرەی پلەی ئیمانەکەی لە ناخی خۆیدا هەست بەمە دەکات.

بەڵێ، نەخۆشییە ماددی و جوزئییەکان لە ژێر تەوژمی لێزمەی بارانی ئەو شادمانییە مەعنەوی و چێژ و لەزەتەی ئیماندا، دەتوێنەوە.

## دەرمانی نۆهەم

ئەی نەخۆشی باوەڕدار بە پەروەردگاری بەدیهێنەر!

زۆربەی ئازار و ترس و بیمەکانی (نەخۆشی) دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە هەندێ جار دەبێت بەهۆی "مردن" و "لەناوچوون"!

جا لەبەر ئەوەی ڕوانینی بێ ئاگایانە "مردن" بە سامناك و ترسێنەر پیشان دەدات، ئەوا لەم ڕووەوە (نەخۆشی) هەندێ نیگەرانی و مەترسی دەخاتە بەردەمی مرۆڤ!

لەبەر ئەوە:

یەکەم: باش بزانە و ئیمانی دامەزراوت هەبێت بەوەی کە:

"ماوەی ژیان (ئەجەل) ئەندازەی خۆی هەیە و، هیچ ئالوگۆڕ و زیاد و کەمی‌یەکی تێدا نابێت". ئەوەتا هەندێ جار ڕووی داوە کە نەخۆش گەیشتووەتە گیانەلاّ و سەرەمەرگ، کەچی لە جاران باشتریش چاك بووەتەوە. بەلاّم ئەو لەش ساغانەی کە بۆی دەگریان، ئەوان مردن و کۆچی مالئاواییان لە دنیا کرد!

دووهەم: مردن - لە ڕاستیدا - سامناك نی‌یە، وەك ئەوەی بە ڕوالەت دێتە پێش چاو.

لە گەلێ پەیامدا بە چەندین بەلگەی سەلمێنەر و گومانبڕ چەسپاندوومانە و بە بەرەکەت و لێشاوی قورئانی پیرۆزیش ڕوونمان کردووەتەوە کە: "مردن" بۆ مرۆڤی باوەڕدار و ئەهلی ئیمان بریتی‌یە لە:

تەواوبوونی فەرمانبەرێتیی ژیان و ئێش و ئازارەکانی..

کۆتایی هێنانە بە پەرستش، کە - لە ڕاستیدا - فێرکاری و ڕاهێنان و مەشق کردنە لە گۆڕەپانی تاقیکردنەوەی دنیادا..

دەرگایەکە بۆ ڕۆشتنە ژوورەوە و بە یەك شادبوونەوە لەگەڵ نەوەد و نۆ لە سەدی دۆستان و خۆشەویستان، کە پێشتر کۆچیان بۆ ئەودنیا کردووە..

هۆکارێکە بۆ چوونە ناو گۆڕەپانی نیشتمانی ڕاستەقینەی مرۆڤ و ژیانی بەختیاریی هەمیشەیی و هەتاهەتایی..

بانگهێشتێکە بۆ دەربازبوون لە بەندیخانەی دنیا بەرەو باخ و گوڵزارەکانی بەهەشتی بەرین..

هەل و دەرفەتی پاداشت وەرگرتنی ئەو خزمەتگوزارییانەیە کە بەجێ هێنراون، کە پاداشتێکە لە گەنجینەی بەخششی بەدیهێنەری میهرەبانەوە بە بێ ژمارە و بەوپەڕی سەخاوەت دەڕژێت و دەبارێت.

جا مادەم "مردن" لە ڕووی ڕاستییەوە بۆ ئیمانداران بەو جۆرەیە، ئەوا نابێت بە شێوەیەکی سامناك سەیر بکرێت، بەڵکو دەبێ بە نیشانەی میهرەبانی و بەختیاری بزانرێت. تەنانەت هەندێ لە پیاوچاکان کە سامیان لە مردن بووە، لە ترسی مردن نەبووە، بەڵکو ویستوویانە بەهۆی درێژەدان بە ژیانی دنیا چاکەی زیاتر پاشەکەوت بخەن و پاداشتی زیاتریان دەست بکەوێت.

بەڵێ، "مردن" بۆ ئیمانداران دەرگای میهرەبانییە و.. بۆ سەرلێ شێواوانیش بیرێکی تاریکی هەمیشەییە!

## دەرمانی دەهەم

ئەی نەخۆشی بێزار کە بێ هیچ هۆیەك خۆت بێزار کردووە!

دیارە لەتاو ئازاری سەختی نەخۆشییەکەت وا نیگەران و بێزار بوویت.

بەڵام خۆ ئەم "بێزاری"یەش نەخۆشییەکەت پتر زیاد و دژوار دەکات!

ئەگەر دەتەوێت ئازاری نەخۆشی‌یەکەت کەم بیێتەوە، ئەوا هەتا دەتوانیت واز لە نیگەرانی و بێزاری بهێنە و، بیر لە سوودەکانی نەخۆشی و پاداشتەکانی بکەرەوە و، بزانە کە مرۆڤی نەخۆش دەبێ بۆ ڕزگاربوون و چاکبوونەوە هەوڵ بدات، نەك بێزاری دەرببڕێت. ڕەگ و ڕیشەی بێزاری لە دڵی خۆتدا دەربهێنە، ئەو کاتە ڕەگ و ڕیشەی نەخۆشی‌یەکەشت لەگەڵیدا بنەبڕ دەبێت.

بەڵێ، بێزاربوون و بیرکردنەوە لە نەخۆشی، نەخۆشی‌یەکەت دەکات بە دوان و ماوەکەشی درێژە پێ دەدات. چونکە "نیگەرانی"ی ئەنجامی پاڵەپەستۆی نەخۆشی‌یە ماددی‌یەکەت، نەخۆشی‌یەکی مەعنەوی و نهێنیش لە دڵ و دەروونتدا دروست دەکات و، هەتا ئەو نەخۆشی‌یە پەنهانە بمێنێت نەخۆشی‌یە ماددی‌یەکەش لە ژێر سایەیدا هەر دەمێنێتەوە!

بەڵام ئەگەر بە یادکردنەوەی حیکمەتی نەخۆشی، خەفەت و بێزاریت لە دڵی خۆت ڕەواند و، بە قەزای خوای گەورە ڕازی بوویت و، خۆت تەسلیمی قەدەری ئەو کرد، ئەوا بەشێکی گرنگی نەخۆشی‌یە ماددی‌یەکەت ڕیشەکەن دەبێت و دەڕەوێتەوە.

خۆ ئەگەر نەخۆشیی "ماددی" بیرکردنەوە و خەفەتی لەگەڵدا بێت، ئەوا ڕێژەی یەك لە دەی، دەگاتە دە لە دەی تەواوەتی، بەڵام بە نەمانی نیگەرانی و خەم وخەفەت، نۆ لە دەی نەخۆشی‌یەکەت دەڕوات و ئازارەکەی کەم دەبێتەوە!

جا هەروەك بێزاری و نیگەرانی و خەفەت نەخۆشی‌یان پێ زیاد دەبێت، کارێکیش دەکەن مرۆڤی نەخۆش دانستی خوای گەورە تاوانبار بکات و ڕەخنە لە میهرەبانیی خوا بگرێت و سکاڵا بەرامبەر بەدیهێنەری میهرەبانی دەربڕێت! لەبەر ئەوە، خوای گەورە – بە پێچەوانەی ئامانجی ئەو نەخۆشە –

زللەی تەمێ و پەروەردە کردنی تێ دەسرەوێنێت، کە ئەمەش دەبێت بەهۆی زیاد بوونی نەخۆشی‌یەکەی. چونکە هەروەك شوکرانەبژێری نیعمەتی پێ زیاد دەبێت، سکالاش پەرە بە نەخۆشی دەسێنێت!

ئنجا ئەوەش هەیە کە بێزاربوون و دلتەنگی خۆی لە خۆیدا نەخۆشی‌یەکی سەربەخۆیە. چارەسەر کردنیشی تەنها بە زانین و ناسینی حیکمەتی نەخۆشی دەبێت. خۆ کە ئەو دانستەشت زانی، ئەوا زانینەکەت بکە بە مەرهەمێکی سارێژکاری زامەکانت و، خۆت قوتار بکە و، لە بریی وتنی: "ئاخ و ئۆف"، بلێ: "الحمد لله علی کل حال"!

## دەرمانی یازدەهەم

ئەی برای نەخۆشی ئارام لێ براو!

هەرچەند ئێستا نەخۆشی‌یەکەت ئازارت دەرخوارد دەدات، بەلام لە هەمان کاتدا و لەبەر نەمانی نەخۆشی و ئازاری پێشوو، لەزەتێکی مەعنەوی و پەنهانت پێ دەچێژێت. وێڕای ئەو لەزەتە ڕۆحی‌یەش کە لە پاداشتی نەخۆشی‌یەوە سەرچاوە دەگرێت!

زەمانی پاش ئەمڕۆ، تەنانەت پاش ئەم سەعاتە، هیچ نەخۆشی‌یەکی تێدا نی‌یە. خۆ بێ گومان هەر شتێك کە نەبێت ئازاریشی نی‌یە، خۆ مادەم ئازار نەبێت ئەوا سکالاش نابێت. بەلام لەبەر ئەوەی بە وەهمێکی هەڵە بیری لێ دەکەیتەوە، ئەوا ئازارت بۆ پەیدا دەبێت.

ئەوەتا لەگەڵ تەواوبوونی ماوەی نەخۆشیی ماددی، ئازارەکەشی تەواو بوو، بەلام پاداشتەکەی و، تام و چێژی تەواوبوونی هەر دەمێنێت. کەواتە یادکردنەوەی نەخۆشی و ئازاری ڕابوردووت، یان بەکاربردن و تەواو کردنی هەرچی هێز و وزەی ئارامگرتنت هەیە لەو یادکردنەوەیەدا، بە گێژی و

گەلحۆیی تەنانەت بەوپەڕی شێتی دادەنرێت، لە کاتێکدا کە پێویستە شادمانی و خۆشحاڵی بۆ ئەو پاداشتە دەربڕیت کە نەخۆشیی ڕابوردووت بۆی پاشەکەوت کردوویت!

ئەمە سەبارەت بە "ڕابوردوو".

خۆ "ئاینده"ش هێشتا نەهاتووە. جا ئایا کارێکی دوور لە ژیری نییە کە هەر لە ئێستاوە بیر لە شتێك بکەیتەوە کە هێشتا لە دایك نەبووە؟ یان خەم بۆ نەخۆشییەك بخۆیت کە هێشتا نەهاتووە؟! یاخود بۆ ئازارێك کە هێشتا ڕووی نەداوە؟!

ئەم جۆرە بیرکردنەوانە دەگەڕێنەوە بۆ ئەوەی کە مرۆڤ بە زۆر لەخۆ کردن ئازاری خۆی زیاد دەکات و لە پاشاندا ئەم کارە پاڵ بە مرۆڤەوە دەنێت کە هیچ ئارامێکی لەلا نەمێنێت، بە شێوەیەك کە سێ جۆر "نەبوون" لە سێ پلەی جۆرەکانی "بوون"دا دابنێت. جا ئایا ئەمە شێتی نییە؟!

پاشان مادەم نەخۆشییەکانی پێش ئەم ماوەیەت مایەی شادمانی و خۆشحاڵی بن، ئنجا ماوەی ئایندەش هێشتا نەهاتووە و لە پلەی "نەبوون"دایە، ئەوا دیارە نەخۆشیی تێدا نییە و پاشان ئازاریشی نییە!

جا تۆش - ئەی برای بەڕێزم - ئەو هێزی خۆڕاگری و ئارامەی کە خوای گەورە بە میهرەبانیی خۆی پێی بەخشیویت، بە ڕاست و چەپدا بڵاوی مەکەرەوە، بەڵکو هەموویان پێکەوە لە بەرامبەر ئەو ئازارەدا ڕابگرە کە لەم سەعاتەی ئێستادا هەستی پێ دەکەیت و، بڵێ: "یا صبور"!

ئیتر دان بە خۆتدا بگرە و، پاداشتی ئەم ئارامگرتنەشت لای خوای گەورە پاشەکەوت بکە.

## دەرمانی دوازدەهەم

ئـەی ئـەو نەخۆشـەی کـە خواپەرسـتی و زیکـر و ویردە کـانی بـەهۆی نەخۆشی‌یەوە لەدەست دەرچووە!

ئەی ئەو کەسەی بەداخەوەیە بۆ ئەو لەدەستچوونە!

بزانە کە لە "واتا"ی فەرموودەیەکی[1] پیرۆزی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە، کە: (بـاوەڕداری خـاوەن تـەقوا لـە کـاتی "نەخۆشـی"دا پاداشـتی ئـەو پەرستشانەی بۆ دەنووسـرێت کـە پێشـتر بەجێی دەهێنـان و، نەخۆشی ڕێ لـە پاداشتیان ناگرێت).

جا ئەگەر نەخۆش بە گوێرەی توانا فەرزەکانی جێ‌بەجێ بکات، ئەوا ئەو ئەندازەیە جێی سوننەت و ویردەکانیشی بۆ دەگرێتەوە. تەنانەت لـە کـاتی تەوژمی نەخۆشیدا گەلێ بە باشی جێیان دەگرێتەوە، چونکە مرۆڤی نـەخۆش لـەو کاتانەدا بە ئارایشتی "ئـارامگرتن" و "پشـت بـە خـوا بەسـتن" خـۆی دەڕازێنێتەوە و، بەگوێرەی توانا فەرزەکانی بەجێ دەهێنێت.

جگـە لـەوەش، مـرۆڤ لـە کـاتی نەخۆشـیدا هەسـت بـە "لاوازی" و "دەستەوسانی"ی خۆی دەکات و، بە زمانی گوفتار و زمانی حـاڵی لاوازی و بێ دەستەڵاتی‌یەکەی لە دەرگانەی خوادا دەلاڵێتەوە. خوای گەورەش بۆ ئەوە "لاوازی" و "دەستەوسانی"ی بێ سنووری لـە سروشتی مرۆڤدا داناوە تـاکو هەمیشـە هانا بۆ دەرگانـەی خـوای گـەورە بیـات و لێـی بپاڕێتـەوە. چونکـە

---

(١) عن أبي موسى أن النبي ﷺ قال: "إذا مرض العبد أو سافر، كتب الله تعالى له من الأجـر مثل ما كان يعمل صحيحاً مقيماً". أخرجه أحمـد والبخـاري. واتە: گەر بەندەیەك نـەخۆش کەوت یان ڕۆشت بۆ سەفەر، ئەوا خوای گەورە بە ئەندازەی پاداشتی ئەو کردەوە باشانەی بۆ دەنووسێت کە ئەو بەندەیەی لە کاتی لەش ساغی و پێش سەفەرەکەیدا ئەنجامی دەدا. (وەرگێڕ)

حیکمەتی بەدیهێنانی مرۆڤ و مایەی سەرەکیی بایەخ پێدانی تەنها دوعا و پاڕانەوەیە، وەك لە ناوەڕۆکی ئەم ئایەتە پیرۆزەوە دەردەکەوێ کە دەفەرموێ:

﴿قُلْ ما يَعْبَؤُاْ بِكُمْ رَبِّي لَوْلا دُعاؤُكُمْ﴾[1] (الفرقان:٧٧).

جا لەبەر ئەوەی نەخۆشی هۆکارێکە بۆ پاڕانەوە و نزای پاك و بێگەرد، ئەوا سکالاّ کردن لە دەست نەخۆشی کارێکی ڕاست و ڕەوا نییە، بەڵکو ئەرکی سەرشانی مرۆڤ لە کاتی نەخۆشیدا "شوکرانەبژێری"ی خوای گەورەیە. چونکە نابێ بە چاکبوونەوە لە نەخۆشی ئەو کانیاوە پاراوەی دوعا و نزا پڕ بکرێتەوە کە نەخۆشی تەقاندوویەتیەوە!

## دەرمانی سیازدەهەم

ئەی نەخۆشی داماوی دەم بە سکالاّ!

نەخۆشی بۆ هەندێ کەس دەبێت بە گەنجینەیەکی گەورە و دیارییەکی بەنرخی خوایی. هەموو نەخۆشێکیش بۆی هەیە نەخۆشییەکەی خۆی لەو جۆرە نەخۆشییانە بژمێرێت. چونکە دانستی خوای گەورە خواستی وایە کاتی "مردن" دیاری نەکرێت، تاکو مرۆڤ لە نائومێدیی ڕەها و لە بێ ئاگایی ڕەهاش دەرباز ببێت و، لە ناوەندی ترس و ئومێد(الخوف و الرجاء)دا بمێنێتەوە. بۆ ئەوەی ژیانی هەردوو دنیای بپارێزێت و، لە کەندەلانی زەرەرمەندی و ڕسواییدا بەرنەبێتەوە..

واتە "مردن" هەموو کاتێك دەتوانێت مرۆڤ بەسەر بکات و هیچ شتێك ڕێی لێ نەگرێت!

جا ئەگەر لە کاتی بێ ئاگایی مرۆڤدا دەستی خۆی وەشاند، ئەوا زیانێکی زۆر لە هەردوو دنیای دەدات. بەڵام "نەخۆشی" ئەو بێ ئاگاییەی مرۆڤ

---

(١) واتە: ئەگەر لەبەر بەندایەتی و پاڕانەوەتان نەبێ پەروەردگارم گوێتان ناداتێ. (وەرگێڕ)

دەرەوێنێتەوە و هەمیشە یادی ڕۆژی دوایی لە زەین و دڵ و دەروونیدا ئامادە دەکات. تەنانەت هەندێ جار نەخۆش لە ماوەی بیست ڕۆژی نەخۆشیدا هێندە سوود و قازانجی زۆری دەست دەکەوێت کە نەتوانێت بە ئاسانی لە ماوەی بیست ساڵدا بەدەستی بهێنێت!

بۆ نموونە: دوو لاو هەبوون - خوا لێیان خۆش بێت - یەکێکیان ناوی "صەبری" و خەڵکی گوندی "ئیلاما" و، ئەوی تریان ناوی "مستەفا وەزیرزادە" و خەڵکی گوندی "ئیسلام کۆی"[1] بوو.

هەرچەند لەناو قوتابییەکانمدا تەنها ئەم دوانە نەخوێندەوار بوون، کەچی هەمیشە لە پلەی یەکەم و پۆلی پێشەوەی وەفا و ڕاستیی خزمەتی ئیماندا دەمبینین. حیکمەتی ئەمەشم لە کاتی خۆیدا نەدەزانی. بەڵام پاش کۆچی دواییان بۆم دەرکەوت کە هەریەکەیان تووشی نەخۆشییەکی قورس و سەخت بووبوون و، بە ڕێنمایی ئازاری نەخۆشییەکەیانەوە گەیشتبوونە پلەیەکی بەرزی خواناسی و لە خزمەتێکی بەرزدا تێدەکۆشان کە لە ڕۆژی دواییدا سوودیان پێ بگەیەنێت. بە پێچەوانەی ئەو لاوە بێ ئاگایانەی کە تەنانەت فەرزەکانیشیان بەجێ ناهێنن.

لە خوای گەورە دەپاڕێینەوە کە ئەو دوو ساڵە پڕ لە ئازار و نەخۆشییەی دنیایان بۆ بکات بە ملیۆنەها ساڵی بەختەوەری لە ژیانی هەمیشەیی بەهەشتی بەریندا.

ئێستا تێدەگەم کە هەرچی دوعای شیفام بۆ کردوون بووە بە دوعاکردن لێیان! بەڵام لە دەرگانەی خوای گەورە ئومێدەوارم کە نزا و پاڕانەوەکانم بۆ تەندروستیی دواڕۆژیان گیرا بکات!

---

(١) "ئیلاما" هەروەها "ئیسلام کۆی" (واتە گوندی ئیسلام) دوو گوندی سەر بە پارێزگای ئیسپارتەن، دەکەونە دەستە چەپی ڕێبواری ڕێی "ئیسپارتە - بارلا". (وەرگێڕ)

بەم جۆرە و بەپێی قەناعەتی خۆم، پێم وایە کە ئەم دوو لاوە توانییان قازانجێکی وایان دەست بکەوێت مرۆڤ بە لای کەمەوە بە دە ساڵی تەقوا و هەوڵ و کۆشش ئنجا دەستی بکەوێت[1].

خۆ ئەگەر ئەوان - وەك هەندێ لاو - بە تەندروستی‌یەوە بنازینایە و لەو ڕێیەوە خۆیان بەرەو تەڵە و داوی هەرزەیی و بێ ئاگایی پاڵ پێوە بنایە و، "مردن"یش لە کاتی گەوزانیان لەناو قوڕ و لیتەی تاوان و تاریکیی گوناهباریدا دەرفەتی لێ بهانینایە، ئەوا ناو گۆڕەکانیان لانە و کونی مار و دووپشك دەبوو، لە بریی ئەوەی کە ئێستا گەنجینەی نوور و شادمانی‌یە.

جا مادەم نەخۆشی ئەم سوودە زۆرانەی لە دووتوێدایە، ئەوا نابێ سکاڵای لە دەست بکرێت، بەڵکو دەبێ مرۆڤی نەخۆش لە ڕێی تەوەککول و ئارامگرتن و شوکر و ستایشی خوای گەورەوە، هەردەم پشت بە میهرەبانیی خوای گەورە ببەستێت.

## دەرمانی چواردەهەم

**ئەی ئەو نەخۆشەی کە پەردە بەسەر چاوانیدا هاتووە!**

ئەگەر هەست بکەیت و بزانیت لە ژێر ئەو پەردەیەی کە بەسەر چاوی نابینایانی ئەهلی ئیماندا دادراوەتەوە ڕووناکی‌یەکی لەڕادەبەدەر و چاوێکی مەعنەویی دووربین هەیە، ئەوا پڕ بە دەم دەڵێت:

---

(١) عن أبي هريرة رضي الله عنه أن النبي ﷺ قال: "إن الرجل ليكون له عند الله المنزلةُ، فما يبلغها بعمل، فما يزالُ الله يبتليه بما يكره حتى يُبلغه إياها". حديث حسن، أخرجه أبو يعلى في مسنده ٤/١٤٤٧ وابن حبان في صحيحه ٦٩٣ والحاكم ١/٣٤٤ وانظر: (الأحاديث الصحيحة ١٥٩٩). واتە: هەندێ جار مرۆڤ پلەی بەرزی لای خوای گەورە هەیە و، بە کردەوەی باشی خۆیشی نەگەشتووەتە ئەو پلەیە، بەڵکو خوای گەورە بەردەوام بەو شتانە گیرۆدەی دەکات کە ئەو مرۆڤە پێی ناخۆشە، کەچی ئەو هەر ئارام دەگرێت هەتا خوا دەیگەیەنێتە ئەو پلەیە. (وەرگێڕ)

"هەزار جار شوکر و سوپاس بۆ پەروەردگاری میهرەبانم"!

وا بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو مەرهەمە سارێژکارە، ئەم ڕووداوەی خوارەوە دەگێڕمەوە:

پووری کاك "سلێمان"ی خەڵکی بارلا، کە هاوڕێیەك بوو هەشت ساڵی ڕەبەق و بێ ئەوەی بێزاری دەربېڕێت ڕێزی تەواوەتیی لێ دەگرتم و خزمەتی بێگەردی دەکردم، چاوەکانی کوێر بوون و ترووسکاییان لێ بڕا!

ئنجا لەبەر ئەوەی ئەم ئافرەتە ئایینداڕ و خواناسە لە شایستەیی خۆم زیاتر گومانی باشی بە من هەبوو، ئەوا ڕۆژێکیان کە لە مزگەوت هاتمە دەرەوە بەرەو ڕووم هات و، وتی: "لەبەر خوا دوعایەك بۆ چاوەکانم بکە"!

منیش لە لایەنی خۆمەوە ساڵحی و دینداری ئەو ئافرەتە پیرۆز و بێگەردەم کرد بە هاوڕێ و تکاکاری پاڕانەوەکەم و، پڕ بە دڵ لە خوای گەورە لاڵامەوە و، وتم:

(ئەی خوای پەروەردگارا لەبەر خاتری ئاییندارێ خۆی پەردەی سەر چاوەکانی لابدە)!

هەر ڕۆژی دوای ئەمە، پزیشکێکی پسپۆڕی چاو لە پارێزگای "بوردوور"ەوە - کە شوێنێکی نزیکە - هات و تیماری چاوەکانی کرد و چاك بوونەوە!

کەچی چل ڕۆژ دوای ئەمە چاوەکانی جارێکی تر تاریکاییان داهاتەوە! منیش گەلێ دڵگران بووم و زۆریش بۆی پاڕامەوە. ئومێدەوارم نزا و پاڕانەوەکانم بۆ دواڕۆژی گیرابووبن، چونکە ئەگەر وا نەبێ ئەوا من - بە هەڵە و بێ ئەوەی بە خۆم بزانم - دوعام لێ کردووە! چونکە چل ڕۆژی تر ماوەی ژیانی مابوو، پاش ئەو چل ڕۆژە بەرەو خانەی میهرەبانیی فراوانی خوای گەورە کۆچی ماڵئاوایی کرد!

جا ئەو خوا لێخۆشبووە لە بریی ئەوەی بە چاوی بەسۆزی پیری لەو چل ڕۆژەدا سەیری باخچە خەم بزوێنەکانی "بارلا"ی بکردایە و، چێژی لێ وەربگرتنایە و، بۆ هەردە جوان و سەوزەکانی ئەوێی بڕوانیایە، ئێستا - لە بریی ئەوە و بۆ هەزاران ڕۆژ - لە گۆڕەکەیدا سەیری باخچە ڕازاوە سەوز و دڵگیرەکانی بەهەشتی بەرین دەکات. چونکە خاوەنی ئیمانێکی دامەزراوی توندوتۆڵ و خواناسی‌یەکی خاوێن و درەخشان بوو.

بەڵێ، ئەگەر باوەڕدار بە "نابینایی" بڕواتە ناو گۆڕەکەی، دەتوانێت - بە پێی پلەی ئیمانی خۆی - لە ڕوانگەیەکی گەورەتر لە ڕوانینی دانیشتووانی گۆڕستان، سەیری جیهانی ڕووناکیی بەهەشت بکات و، بە وێنەی ئەوەی کە ئێمە لەم جیهانەدا هەندێ شت دەبینین باوەڕدارە کوێرەکان نایانبینن، ئەو نابینایانەش - ئەگەر ئەهلی ئیمان و خواپەرستی بن - لە گۆڕەکانیاندا - بە هەمان پلە - شتانێك دەبینن کە خەڵکی گۆڕستان نایانبینن. وەك بڵێی هەریەکەیان دووربینێکیان لە لا بێت کە بە چاوی خۆیان باخچە و نیعمەتەکانی بەهەشتی پێ ببینن. ئەو دووربینانەش بە وێنەی شریتی سینەما دیمەنە ناوازە و ڕازاوەکانی بەهەشت لە بەرچاوی ئەو ئیماندارانەدا دەردەخات کە لە ژیانی دنیادا لە بینایی چاویان بێ بەش بوون.

دەسا ئەی برای بەڕێزم! تۆش دەتوانیت ئەم چاوە نوورانی‌یەت دەست بکەوێت کە بە هۆیەوە بتوانیت لە ژێر خاکدا سەیری بەهەشتی بەرینی سەرووی ئاسمانەکانی پێ بکەیت. ئەوەش تەنها بە ئارامگرتن و شوکرانە کردن دەبێ لەسەر ئەو پەردەیەی کە بەسەر چاوەکانتدا دادراوەتەوە.

بیشزانە ئەو پزیشکە پسپۆڕەی کە دەتوانێت ئەو پەردەیە لەسەر چاوت لابدات و بەو چاوە ئیمانی‌یە ببینیت: تەنها هەر "قورئانی پیرۆز"ە!

## دەرمانی پازدەهەم

ئەی نەخۆشی دەم بە ناڵە و هاوار!

هەرگیز هاوار مەکە و مەناڵێنە کاتێ کە سەیری شێوەی ناشیرین و بێز لێکراوی نەخۆشی دەکەیت! بەڵکو سەیری واتا و ناوەرۆکەکەی بکە و، بڵێ: "سوپاس بۆ خوا"!

خۆ ئەگەر نەخۆشی لە ناوەرۆکدا شتێکی جوان نەبوایە، ئەوا بەدیهێنەری میهرەبان گەورەترین خۆشەویستانی خۆی گیرۆدەی ئازار و نەخۆشی نەدەکرد. ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ لە "واتا"ی فەرموودەیەکیدا دەفەرموێ:

"أشد الناس بلاءً الأنبياءُ ثم الأولياءُ، ثم الأمثل، فالأمثل"[(١)]. أو كما قال.

پێغەمبەری ئارامگر "حەزرەتی ئەییووب" - دروودی خوای لەسەر بێت - سەرکاروانی بەڵادارانە و، پاش ئەویش پێغەمبەرەکانی تر و ئنجا دوای ئەوانیش ئەولیاکان و پاشان پیاوچاکانی تر.

هەموو ئەو زاتانە سەرجەمی ئێش و ئازارەکانیان بە دیارییەکی خوایی زانیوە و، وەك پەرستشێکی بێگەرد پێشکەشیان کردووە و، هاودەم لەگەڵ ئارامگرتندا شوکرانەبژێر بوون و، ئازارەکانیان وەك جۆرە نەشتەرگەرییەکی دڵ و دەروون سەیر کردووە کە خوای میهرەبان پێی بەخشیون.

---

(١) واتە: پێغەمبەران لە هەموو کەسێك زیاتر دووچاری بەڵا و گیروگرفت دەبن، پاش ئەوان پیاوچاکان، پاشان لەوان بەرەو خوارتر و بەرەوخوارتر. گەلێ فەرموودەی صەحیح بەم واتایە هەن، وا ئەم دانەیان لێ دەهێنین: عن أخت حذيفة رضي الله عنهما: أن رسول الله ﷺ قال: (أشد الناس بلاءً الأنبياء ثم الصالحون، ثم الأمثل فالأمثل). رواه الطبراني في الكبير. (انظر صحيح الجامع الصغير برقم ١٠٠٥). (وەرگێڕ)

جا تۆیش - ئەی نەخۆشی دەم بە نالـە و هـاوار! - ئەگـەر دەتـەوێت بـەم کاروانە پاك و نوورانی‌یە بگەیتەوە، ئەوا هاودەم لەگەڵ ئارامی و خۆڕاگریـدا هەرگیز لە شوکرانە بژێریی خواوەند دەرمەچۆ. دەنا گەر - خوا نەخواستە - هـەر لەسـەر سکاڵا بـەردەوام بیـت، ئـەو کۆمەڵـە لـە ڕیـزی کاروانەکـەیاندا وەرت ناگرن. دیارە ئەو کاتەش ڕێیەکی هەڵەتی تاریك دەگریتە بەر و خۆت لە هەڵدێری بێ ئاگاییەوە بەردەدەیتە خوارەوە!

بەڵێ، هـەندێ نەخۆشـی هـەن گـەر مردنیـان بـە دوادا بێـت خاوەنەکـەیان دەگەیەنـنـە پلـەی "شـەهیدي مەعنـەوی". واتـە پلـەی "ئـەولیاکان"ی پـێ دەبەخشرێت. وەك نەخۆشی‌یەکانی (زەیستانی[1]، سکێشە، مردن بە تاعوون، سووتان، خنکـان لـە ئـاودا). جـا ئەگـەر کەسـێك بـەهۆی هەریـەك لەمانــەوە بمرێت ئەوا دەگاتە پلەی شەهیدی مەعنەوی. بەم جۆرە، گەلـێ نەخۆشی هەیە کە ئەگەر مردنیان بە دوادا بێت خاوەنەکەیان دەگەیەننە پلەی ویلایەت.

جا هەروەك "نەخۆشی" خۆشەویستیی زیاد لـە پێویستی دنیـا و پـەیوەندیی تـونـدوتـۆڵی مـرۆڤ بــە دنیــاوە کــەم دەکاتــەوە، ڕادەی تـاڵی و ئــازاری لێکدابڕان و جوداییش لە دڵی ئەهلی دنیادا سووك و کەم دەکـات کاتـێ کـە دنیا بەجێ دەهێڵن، تەنانەت هەندێ جار ئەو لێکدابڕانەیان لەلا خۆشەویسـت دەکات!

## دەرمانی شازدەهەم

ئەی نەخۆشی سکاڵاکار لە دەست بێزاری و بێتاقەتی!

"نەخۆشی" گرنگترین پەیوەندیدەری ژیانی کۆمەڵایەتی و مرۆڤایەتی فێری نەخۆش دەکات، کە بریتی‌یە لە "ڕێزگرتن" و "خۆشەویستی"!

---

(١) ئـەم نەخۆشـی‌یە هـەتا مـاوەی چل ڕۆژی زەیسـتانی، ئـەو پلـەی "شـەهیدی مەعنـەوی"یـە بـە خاوەنەکەی دەبەخشێت. (دانەر)

چونکە نەخۆشی خاوەنەکەی دەرباز دەکات لەوەی کە لە خەڵکی دوورەپەرێز بێت و پێویستی بە کەس نەبێت و هەر بە تەنها بۆ خۆی بژی!

وەك ئاشکرایە ئەم ڕەفتار و خووە مرۆڤ دووچاری هەستی نامۆیی دەکات و بەزەیی لە دڵدا دەردەهێنێت، چونکە هەروەك لەم ئایەتە پیرۆزەوە دەردەکەوێت کە دەفەرموێ:

﴿إِنَّ الإِنْسانَ لَيَطْغَى أَنْ رَآهُ اسْتَغْنَى﴾ (العلق:٦-٧)..

ئەو دەروونەی کە هاندەری خراپکارییە و، بەهۆی لەش ساغییەوە کەوتووەتە داوی ئەوەی کە خۆی لە کەسانی دەوروبەری بێ نیاز بزانێت.. ئەو دەروونە، هەست بە هیچ ڕێزێك ناکات سەبارەت بە پەیوەندیی برایەتی و، سۆز و بەزەییشی بەرامبەر نەخۆش و خاوەن بەڵا و گیرۆدەبووان ناجووڵێت، کە شایانی ئەو سۆز و بەزەییەن.

بەڵام مرۆڤی نەخۆش، لە ژێر تەوژمی نەخۆشییەکەیدا ڕادەی "دەستەوسانی" و "هەژاری"ی خۆی بۆ دەردەکەوێت و، حەز دەکات ڕێز لەو برا باوەڕدارانەی بگرێت کە لە کاتی نەخۆشیدا چاودێریی دەکەن و ئەوانەش دێن بۆ سەردان و دڵخۆشی دانەوەی.

جگە لەوەش - لە ڕوانگەی خۆیەوە - هەست بە سۆز و بەزەیی مرۆڤانە دەکات بەرامبەر هەموو خاوەن گیروگرفت و موسیبەتێك. بێ گومان ئەم سۆز و بەزەییەش گرنگترین ڕەوشتی ئیسلامەتی و ڕەفتاری موسڵمانانەیە. ئیتر بەزەیی بە حاڵیاندا دێتەوە و، گەر بیشتوانێت یارمەتییان دەدات، هیچ نەبێ لە دوعا و نزا و سەر لێدان و هەواڵ پرسینیان دریغی ناکات..

بەم جۆرە سوننەتێکی گەورە بەجێ دەهێنێت و پاداشتەکەشی دەستی خۆی دەخات.

## دەرمانی حەڤدەهەم

ئەی ئەو نەخۆشەی کە سکالاًی دەستەوسانیی خۆی دەکات سەبارەت بە کرداری خێر و ئەنجامدانی چاکەکاری!

تا دەتوانیت شوکری خوا بکە!

من مژدەت دەدەمێ کە ئەو کلیلەی دەرگای خاوێنترین جۆری "چاکە"ت بۆ دەکاتەوە خودی "نەخۆشی" خۆیەتی..

"نەخۆشی" وێڕای ئەوەی کە پاداشتێکی باش و نەبڕاوە بەرهەم دەهێنێت، چ بۆ خاوەنەکەی و چ بۆ ئەوانەی چاودێریی دەکەن، باشترین هۆکاریشە بۆ گیرابوونی دوعا و نزاکان!

بەڵێ، چاودێری کردنی نەخۆش پاداشتێکی زۆری بۆ ئیمانداران تێدایە. هەروەها سەر لێدانیان و هەواڵ پرسینیان - بە مەرجی دڵگران نەکردنیان - سوننەتێکی پیرۆزە و[1] لە هەمان کاتدا دەبێتە کەفارەتی گوناهی مرۆڤ.

لە واتای فەرموودەیەکی پیرۆزدا هاتووە کە: "با نەخۆش دوعاتان بۆ بکات، چونکە دوعای گیرایە"[2]. بە تایبەتی ئەگەر نەخۆش خزمێکی نزیکی وەك دایك و باوك بێت، چونکە خزمەت کردنیان پەرستشێکی گرنگە و پاداشتێکی گەورەی هەیە. دڵدانەوەی نەخۆش لە حوکمی "سەدەقە"دایە و، وەك خێرێکی گەورە پاداشتی بۆ دیاری کراوە.

ئەو کەسانە چەندە بەختەوەرن کە خزمەتی دایك و باوکیان دەکەن لە نەخۆشییاندا و، دڵە ناسکەکانی کاتی نەخۆشییان دەدەنەوە و، دڵنەوایی و

---

(١) عن جابر قال رسول الله ﷺ: "أفضل العيادة أجراً سرعة القيام من عند المريض". فيض القدير ١٢٨٥/١ وجمع الفوائد ٣٣٢/١.

(٢) "دعاء المريض مستجاب وذنبه مغفور". مسند الفردوس ٢٨٠/١ جمع الفوائد ٣٣٣/١. وابن ماجه برقم ١٤٤١.

حەوانەوەیان پێ دەبەخشن و، لەو ڕێیەوە نزای بێگەردی ئەو دایك و باوکانەیان دەستگیر دەبێت!

بەڵێ، ئەو ڕاستییەی کە شایانی پلە و ڕێزێکی زیاترە لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا: "سۆز و شەفەقەتی دایك و باوك"ە و، باشترین پاداشتی ئەو شەفەقەت و بەزەییەی دایك و باوکیش بۆ منداڵەکانیان ئەوەیە کە لە ماوەی نەخۆشیی دایك و باوکدا منداڵ و وەچە دڵسۆز و باشەکانیان چاودێری و دڵنەواییان بکەن و بەزەییان بە حاڵیاندا بێتەوە.

ئەم دیمەنە، تابلۆیەکی ئەوتۆیە کە وەفاداری و هەڵوێستی باشی نەوەکان دەردەخات و، لە هەمان کاتیشدا پایە بەرزیی مرۆڤ بە ڕادەیەك پیشان دەدات کە سەرنجی خۆشەویستی و سەرسووڕمانی هەموو بوونەوەران - تەنانەت فریشتەکانیش - ڕادەکێشێت و هەموویان پێکەوە دەخاتە تەکبیر و تەهلیلەوە و دەڵێن: "ما شاء اللّه.. بارك اللّه".

بەڵێ، ئەو سۆز و بەزەییەی کە دەوراندەوری "نەخۆش"یان داوە، ئازاری نەخۆشی دەتوێنێتەوە و، لە بیری دەباتەوە و، دەیگۆڕێت بە تامێکی خۆش و شیرین.

گیرابوونی نزا و پاڕانەوەی نەخۆش مەسەلەیەکی گرنگ و شایستەی بایەخ پێدانە.

سی چل ساڵ لە خوا دەپاڕامەوە بۆ چاکبوونەوەم لە ئازارێك کە لە پشتمدا بوو. پاشان تێگەیشتم کە خوای گەورە لەبەر دوعاکردن "نەخۆشی" بە مرۆڤ دەبەخشێت! جا لەبەر ئەوەی دوعا ناتوانێت خۆی لاببات ئەوا بەرهەمەکەی لە ڕۆژی دواییدایە[1].

---

(١) هەرچەندە هەندێ نەخۆشی هۆیە بۆ دوعاکردن، کەچی گەر دوعا ببێت بە هۆیەك بۆ نەخۆش نەبوون ئەوا وەکو ئەوە وایە کە دوعا ببێت بە هۆکاری نەبوونی خۆی! خۆ دیارە ئەمەش ناگونجێ! (دانەر)

ئنجا دوعـا خۆی لـە خۆیدا جۆرێکـە لـە جۆرەکانی "پەرستش". ئەوەتا نـەخۆش کاتێ هەست بـە دەستەوسـانیی خـۆی دەکـات، پـەنا دەباتـە بـەر دەرگانەی خوای گەورە و لێی دەپاڕێتەوە.

لەبەر ئەوە، گیرانەبوونی ڕواڵەتیی دوعاکانم لە ماوەی ئەو سی ساڵەدا بۆ چاکبوونەوەم لەو نەخۆشی‌یە، وای لێ نەکردم بیر لـە وازهێنـان بکەمـەوە لـە پاڕانەوەکانم، چونکە نەخۆشی کاتی دوعا و پاڕانەوەیە.

چاکبوونەوەش بەرهەمی دوعا نی‌یە، بـەڵکو خوای دانـا و میـهرەبان گـەر بیەوێت شیفا ببەخشێت، ئەوا تەنها لە گەنجینەی گەورەیی و چاکەی خۆیـەوە دەیبەخشێت. خـۆ گیرانـەبوونی پاڕانـەوەشمان بـەو شـێوەیەی کـە خۆمـان دەمانـەوێت ئـەوە ناگەیـەنێت کـە دوعاکانمـان گـیرا نـەبوون، چونکـە پەروەردگاری دانـا لـە ئێمـە باشتر دەزانێت و، ئێمـە لـە چاو زانستی ئـەودا نـەزانین. خـوای گـەورەش ئەوشتەی بـاش و بەکەڵکـە بۆمـانی دەنـێرێت و، هەندێ جاریش دوعا و نزاکانمان کە بۆ ژیانی دنیامان دەیانکەین لە گەنجینـەی میـهرەبانیی خۆیـدا هـەڵیان دەگرێت و پاشـەکەوتیان دەکـات، بۆ ئـەوەی لـە ژیانی دواڕۆژماندا بە کەڵکمان بێت و سـوودی لـێ وەربگریـن. بـەم جۆرە، دوعا و نزاکانمان لە ئەنجامدا هەر گیرا دەبن.

هـەرچۆنێك بێـت، ئـەو دوعایـەی کـە بەوپـەڕی خـاوێنی و دڵسـۆزی‌یەوە بکرێت و، لە سەرچاوەی نەخۆشی‌یەوە هەڵقوڵابێت و، لە ڕێی هەست کردن بە "لاوازی" و "دەستەوسانی" و "هـەژاری"یـەوە هـاتبێت، گەلـێ نزیکـە لـە گیرابوونەوە.

(نەخۆشی)ش بناغە و خولگەی ئەم جـۆرە نزا و پاڕانـەوە خاوێنانەیـە. جـا پێویسـتە نـەخۆش و ئـەو ئیمـاندارانـەش کـە چـاودێریی دەکـەن، سـوود لـەم جۆرە دوعا و نزایانە وەربگرن.

## دەرمانی هەژدەهەم

ئەی ئەو نەخۆشـەی وازی لـە شـو کرانەبژێری هێنـاوە و دووچـاری داوی سکالاّ بووە!

دەربڕینی سـکالاّ ئـەوە دەگەیـەنێت کـە مـافێکت هـەبووبێت و پێشـێل کرابێت. کەچی تۆ هیچ مافێکت نەفەوتاوە هەتا سکالاّی بۆ بکەیت، بەڵکو هێشتا مافی زۆرت بەسەرەوەیە و شوکرانەشت لەسەر پێشـکەش نەکردوون! ئەوەتا هێشتا مافی خوای گەورەت بەجێ نەهێناوە کەچی بە نـاڕەوا سـکالاّ دەکەیت، وەك ئەوەی خۆت بە خاوەن حەق بزانیت!

لە ڕاستیدا مـافی ئەوەت نی‌یە سـەیری ئەو لەش ساغانە بکەیت کە پلـەیان لـە تـۆ بـەرزترە و ئنجـا سـکالاّ دەربـبڕیت، بـەڵکو دەبـێ لـە گۆشـەی تەندروستی‌یەوە سەیری ئەو نەخۆشە دەستەوسان و داماوانە بکەیت کە پلەیان لـە تـۆ نزمـترە و، هەمیشـە بەدەسـت ئێـش و ئـازارەوە دەتلێنـەوە. کەواتـە شوکرانەیەکی زۆرت لە ئەستۆدایە.

جا ئەگەر دەستێکت شکاوە ئاورێك بەلای ئەو کەسانەدا بدەرەوە کە هەردوو دەستیان بڕاوەتەوە.. ئەگەر چاوێکت بینایی نەماوە، بۆ ئەوانـە بڕوانـە کە هەردوو چاویان لەدەست داوە! تاکو شـوکرانە بژێـری پێشکەشـی خـوای گەورە بکەیت.

بەڵێ، لە گۆشـەی نیعمەتەوە هیچ کەسێك مـافی ئەوەی نی‌یە لـە خۆی بەرەوژوورتر بڕوانێت، چونکـە بـەم ڕوانـین و ڕەفتـارەی ئـاگری سـووتێنەری سکالاّی پتر گڕ دەگرێت. بەلاّم لـە کاتی بـەلاّ و موسیبەتدا پێویسـتە لـە خۆی بەرەوژوورتر بڕوانێت و سەیرێکی ئەوانە بکات کە گیرۆگرفت و بەلاّیان لەو زیاترە، تاکو شوکرانەی خوا بکات و بەو حاڵەی خۆی ڕازی بێت.

ئەم نهێنییەش لە هەندێ پەیامدا بە نموونەیەك ڕوون كراوەتەوە، كە ئەمەی خوارەوە ناوەرۆكەكەیەتی:

(كەسێك دەستی هەژارێك دەگرێت و، بە پلیكانەی منارەیەكدا سەری دەخات و، لە هەموو پلەیەكدا دیارییەكی پێ دەبەخشێت، ئنجا لە لوتكە و كۆتایی منارەكەشدا گەورەترین دیاریی دەداتێ و، بەمەش دیارییەكانی كۆتایی پێ دەهێنێت..

جا لە كاتێكدا كە دەبوو ئەم هەژارە سوپاسی بەخشەری ئەم هەموو دیارییە بەنرخانەی بكردایە، كەچی هەموویان لە بیری خۆی دەباتەوە، یان بە چاوێكی كەم سەیریان دەكات و سوپاسیان لەسەر پێشكەش ناكات و، بۆ بەرەوژوورتر دەڕوانێت و، بەدەم سكاڵاوە دەڵێت: خۆزگا ئەم منارەیە بەرزتر دەبوو تاكو بگەیشتمایەتە پلەی كەسانی تر! یان دەڵێ: بۆچی ئەم منارەیە بە ئەندازەی ئەو چیا سەختە یان منارەكەی تەنیشتی بەرزتر نەبوو)؟!

چ پێ نەزانینێكە بۆ ئەو نیعمەتانە و، چەندە تاوان و ستەمێكی گەورەیە لە حەق و ڕاستی، گەر ئەو هەژارە سكاڵای ئاوای لە زار دەربچێت؟!

حاڵی مرۆڤیش بە هەمان جۆرە، ئەوەتا كاتێ لە نەبوونەوە پەیدا بووە، بە "بەرد" و "دار" و "ئاژەڵ" دروست نەبووە، بەڵكو بە مرۆڤێكی موسڵمان بەدیهاتووە و، ماوەیەكی زۆریشی بە تەندروستی بەسەر بردووە و، پلەیەكی بەرزی نیعمەتی خوای گەورەشی بەدەست هێناوە. لەگەڵ ئەمەشدا دەبینیت ئەم مرۆڤە سكاڵا لە نەبوونی تەندروستی دەكات كە لەبەر چەند هۆكارێكی كەم خایەن تەندروستیی لەكیس چووە، یان بەهۆی لێك جیا نەكردنەوەی چاك و خراپ هەندێ نیعمەتی لەدەست داوە، یان ناتوانێت بگاتە ئاستی ئەو نیعمەتانە.. پاشان دەشڵێت:

(ئای بەدبەخت خۆم! من چیم كردووە تا بەم جۆرەم بەسەر بێت)؟

بەم شێوەیە، بێ ئارامیی خۆی دەردەبڕێت. وەك بڵێی ڕەخنە لە خوایەتی خوای گەورە بگرێت!

ئەم جۆرە حاڵانە نەخۆشی‌یەکی مەعنەوی‌یە و، بەڵا و گرفتێکی گەلێ گەورەترە لە نەخۆشی و گرفتە ماددی‌یەکەی خۆی. چونکە ئەم سکاڵایە نەخۆشی‌یەکەی زیاتر دەکات و پەرەی پێ دەسێنێت و، وەکو ئەوە وایە کەسێکی دەست شکاو زۆرانبازی بکات! بەڵام مرۆڤی ژیر دەڵێت:

﴿الَّذِينَ إِذَا أَصَابَتْهُمْ مُصِيبَةٌ قَالُوا إِنَّا لِلَّهِ وَ إِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ﴾.

ئیتر بۆ خۆی ئارام دەگرێت و کارەکانی دەداتە دەستی خوای گەورە، هەتا نەخۆشی‌یەکەی کاری خۆی تەواو دەکات و بە ڕێی خۆیەوە دەڕوات!

## دەرمانی نۆزدەهەم

خوای گەورە کە ناوی: "الأسماء الحسنى"ی بۆ ناوە جوان و بەرزەکانی خۆی هەڵبژاردووە، ڕایگەیاندووە کە ئەو ناوانە هەموویان جوانن..

لە لایەکی تریشەوە ژیان جوانترین ئاوێنەی خواییە. خۆ ئاوێنەیەکیش خاوەنەکەی جوان بێت دیارە خۆیشی جوانە. هەر ئاوێنەیەکش لایەنە جوانەکانی خواوەندی خاوەنی "جوانی" دەربخات و هەرشتێك لە لایەن ئەو خواوەندە جوانەوە بەسەر ئاوێنەکەدا بێت ئەویش جوان دەبێت. کەواتە هەرشتێك بێتە ڕێی ئەو ژیانە، ئەویش - لە ڕاستیدا - هەرجوانە و بە جوان دادەنرێت، چونکە نەخشە ڕەنگینەکانی ناوە جوانەکانی خوای گەورە دەردەخات!

جا ئەگەر ژیان لەسەر یەك ڕەوت و هەر تەنها بە تەندروستی و خۆشی بڕواتە سەر، دەبێت بە ئاوێنەیەکی کەم نرخ و بێ سوود. تەنانەت لەوانەیە هەندێ جار مرۆڤ بەهۆی ئەو جۆرە ژیانەوە هەست بە نەبوون و بێهوودەیی

بکات و ئازار و دڵتەنگی بچێژێت. ئنجا لەو کاتەدا نرخی ژیانیش دێتە خوارەوە و، لەزەت وخۆشیی تەمەنیش دەبێت بە ئازار و خەفەتێکی زۆر لە گەرووی مرۆڤدا. ئیتر یان ئەوەیە ئەو مرۆڤە خۆی دەخاتە ناو چڵکاوی هەرزەیی و کرداری ناپەسەندەوە، یان پەنا دەباتە بەر مەڵبەندەکانی خراپەکاری و بەدڕەوشتی، گوایا بۆ ئەوەی ژیان و کاتی خۆی بە زوویی بباتەسەر، کتومت وەکو ئەو بەندییەی کە دوژمنایەتیی تەمەنی بەنرخی خۆی دەکات و بە خێرایی دەیکوژێت، لە پێناوی تەواو کردنی ماوەی زیندانییەکەی!

بەڵام ئەو ژیانەی کە جموجووڵی تێدایە و بە ئاڵوگۆڕ دەچێتە سەر و چەند قۆناغێکی جۆراوجۆر لەخۆ دەگرێت، مرۆڤ هەست دەکات نرخێکی هەیە و، بەرهەمێکی باش بە تەمەن دەدات و، تامێکی خۆش بە دەروونی مرۆڤ دەچێژێت. تەنانەت وا لە مرۆڤ دەکات کە وێڕای ئەو ئێش و ئازار و دەردیسەرییە جۆراوجۆرانەی دێنە ڕێی، نەیەوێت ژیانی بە فیڕۆ بڕوات و، ئاواتەخوازی ئەوە دەبێت کاتەکانی بەشی کارەکانی بکەن و، هیچ ئاخ و ئۆف و ناڵەیەکی نامێنێت و، هەرگیز نالێت: "کوا خۆر ئاوا ببوایە"؟ یان: "دەبێ کەی ڕۆژ ببێتەوە"؟!

بەڵێ، پرسیار لە دەوڵەمەندێکی دەست بەتاڵ بکە لەوانەی کە هەموو کارێکیان بە گوێرەی دڵ بۆ دەڕەخسێت، لێی بپرسە و بڵێ: چۆنیت؟ چی دەکەیت؟ بێ هیچ گومانێك لە وەڵامدا جۆرە گوفتارێکی پڕ لە خەفەت و ئازاری لێ دەبیستیت، وەك: (ئاخ بە دەست کاتەوە کە بەسەر ناچێت! ئایا نایەیت بەشێك لە کاتەکەمان بەسەر بەرین؟ با ماوەیەك پێکەوە تاوڵە بکەین)! یاخود جۆرە سکاڵایەکی وای لێ دەبیستیت کە هەموویان لە ئومێدی

ژیانێکی درێژخایەنەوە سەرچاوە دەگرن، وەك: (فلان کارم ناتەواوە.. خۆزگە ئاوا و ئاوام بکردایە)!

بەڵام ئەگەر پرسیار لە هەژارێکی گیرۆدەی موسیبەت یان کرێکارێکی چەوساوە بکەیت و، بلێیت: حاڵت چۆنە؟ ئەوا - گەر ژیر بێت - لە وەڵامدا دەڵێت: (سوپاس بۆ خوا من باشم.. هەمیشە لە کاردام و ڕاناوەستم.. خۆزگا زوو خۆر ئاوا نەدەبوو تا کارەکانم تەواو دەکرد.. خۆ "کات" بە لەسەرخۆیی کۆتایی پێ دێت و تەمەنیش لەگەڵیدا دەڕوات و وەستانی نی‌یە. هەرچەند من - لە ڕاستیدا - ماندووم، بەڵام ئەم ماندووبوونەش هەر دەڕوات و هەموو شتێك بەم چەشنە لە ڕۆشتندایە).

دەبینیت بەم وتانەی نرخ و گرنگیی تەمەن دەردەخات لە ناوەندی ئەو داخ و خەفەتەیدا کە بۆ ڕۆشتن و لە دەستچوونی تەمەنی دەری دەبڕێت. کەواتە بە باشی تێدەگات لەوەی کە نرخی ژیان بە ماندووبوون و هەڵگرتنی ئەرکی قورسەوەیە، بەڵام حەسانەوە و تەندروستی و لەشساغی تامی تەمەن تاڵ دەکەن و شێوە جوانەکەشی لە بەرچاوی خاوەنەکەیدا بە ڕادەیەك دەگۆڕن کە ئاواتەخوازی ئەوە بێت بە زووترین کات لەو تەمەنە ڕزگاری ببێت!

دەسا ئەی برای نەخۆشم!

بزانە کە سەرچاوەی هەموو شەڕ و گیروگرفت و تەنانەت بناغەی هەموو گوناهێکیش: نەبوون(العدم)ە، وەك لە پەیامەکانی تردا بە چەندەها بەڵگەی پتەو چەسپاندمان. خۆ "نەبوون"یش شەڕ و خراپەیەکی تەواوەتی و تاریکاییەکی تابلێی نووتەك و لێڵە.

جا ئەو حاڵەتانەی کە لە دۆخی وەستاندان، واتە ئەو کاتانەی کە ژیان لەسەر یەك ڕەوت و بە بێ هیچ گۆڕان و جووڵانێك بەسەر دەچێت، ئەو

کاتانـه، گەلـێ نزیکـترن لــه "نـەبوون" و "بێـهوودەیی"ەوە. ئـەم نزیـك بوونەشیەتی وا لە مرۆڤ دەکات کە هەست بە تاریکیی "نەبوون" بکات و دووچاری دڵتەنگی و بێزاری ببێت..

بەڵام جموجووڵ و ئاڵوگۆڕ "بوون"یان هەیە و کارێك دەکەن مرۆڤ هەست بە "بوون" بکات. خۆ دیارە "بوون"یش خێر و فەڕێکی ئاشکرا و لە بەرچاوە.

جا مادەم حەقیقەت بەم چۆرەیە، ئەوا بزانە نەخۆشی‌یەکەت میوانێکە و بۆ لای تۆ ڕەوانە کراوە، تاکو ئەو کار و ئەرکە زۆرانەی کە پێی سپێرراوە جێبەجێیان بکات. چونکە "نەخۆشی" ژیانە بەنرخەکەت پاڵفتە دەکات و، هێز و پێزی دەداتێ و، بە پلە بەرزەکاندا سەری دەخات و، سەرجەمی ئەندام و ئامێرە مرۆییەکانت بۆ یارمەتیدانی ئەو ئەندامە بیمار و بەئازارەت دەخاتە گەڕ و، نەخشە ڕەنگینەکانی ناوە جوانەکانی بەدیهێنەری دانا دەخاتە ڕوو. پشت بە خوا بەم نزیکانە ئەرکەکانی سەرشانی کۆتایی پێ دەهێنێت و بە ڕێی خۆیەوە دەڕوات و، بانگ لە "تەندروستی" دەکات و پێی دەڵێت:

(ئێستا وەرەوە لە جێی مندا بەردەوام بمێنەرەوە و، سەرلەنوێ ئەرك و فەرمانبەری‌یەکانت ئەنجام بدە، چونکە ئەمە جێی تۆیە و، بۆ خۆت بە خۆشی و شادمانی تیایدا بژی)!

## دەرمانی بیستەم

ئەی ئەو نەخۆشەی بە دوای دەرماندا دەگەڕێیت!

دەبێ بزانیت کە نەخۆشی دوو بەشە:

بەشێکیان نەخۆشیی ڕاستەقینەیە و، ئەوی تریان وەهم و ئەندێشەیە.

سەبارەت بە جۆرە ڕاستەقینەکەیان، خوای گەورە و دانا و شیفابەخش دەرمانی بۆ هەموو دەردێك داناوە و لە گەنجینەی دەرمانخانە گەورەکەیدا - کە گۆی زەوی‌یە - پاشەکەوتی کردوون.

جا ئەو دەرمانانە داخوازی بوونی نەخۆشی‌یەکانن. بەکارهێنانیشیان بۆ ئەم مەبەستە هەر لە بناغەدا کارێکی ڕەوایە و ئایینی ئیسلام فەرمانی پێ داوە. بەڵام دەبێ شیفا و کاریگەریی ئەو دەرمانانە تەنها لە خوای گەورەوە بزانین، چونکە خوای گەورە هەروەك نەخۆشی و دەردی بەخشیوە هەر ئەویش شیفا و چاکبوونەوە دەبەخشێت.

دەبێ "نەخۆش"ی موسڵمانیش گوێڕایەڵی پزیشکە موسڵمان و لێهاتووەکان بێت و، لە ڕێنمایی و ئامۆژگاری‌یان دەرنەچێت. چونکە زۆربەی نەخۆشی‌یەکان لە نەزانینی بەکارهێنانی دەرمان و، گوێ نەدان بە ئامۆژگاریی پزیشك و، ئیسراف و، گوناه و، پارێز نەکردنەوە پەیدا دەبن.

خۆ گومانی تێدا نی‌یە کە پزیشکی دڵسۆز و ئایندار لە بازنەیەکی مەشرووع و ڕەوادا ئامۆژگاریی نەخۆشەکانی دەکات و، بەدئەنجامیی ئیسراف و خراپیی بەکارهێنانی دەرمانەکان دەخاتە پێش‌چاوی نەخۆش و، دڵی دەداتەوە و هیوا و ئومێد بە دڵ و دەروونی دەبەخشێت.

مرۆڤی "نەخۆش"یش لە لایەنی خۆیەوە پشت بەم دڵدانەوە و ئامۆژگاری‌یانە دەبەستێ و، بەرە بەرە نەخۆشی‌یەکەی بەرەو لاوازی دەڕوات و، لە بریی سکاڵا کردن و بێ ئارامی و وەڕسی، دڵی دەگەشێتەوە.

باشترین چارەسەریش بۆ جۆری "نەخۆشی وەهمی" ئەوەیە کە گوێی پێ نەدرێت! چونکە نەخۆشیی وەهمی بە گوێ پێدانی گەورە دەبێت، کەچی بە پێچەوانەشەوە گەر گوێی پێ نەدرێت، بچووك دەبێتەوە و نامێنێت.

هـــەروەك ئەگـــەر كەســـێك هێلانـــە زەردەوالـــە بورووژێنێـــت، ئـــەوا زەردەواڵەكان بەردەبنە گیانی و گەر بایەخیشیان پێ نەدات نزیكی نابنەوە..

هەروەها گەر كەسێك لە تاریكیی شەودا و لە ئاستی پـەتێكی شۆڕەوەبوو لە ئەندێشەیدا بە خەستی ڕۆچوو بێت، لەوانەیە ئەو پەتە لـە بەرچاویدا گـەورە ببێت و بە وێنەی شێت لێی هەڵبێت! بەڵام ئەگەر گوێی پێ نەدات، ئـەوا بـۆی دەردەكـەوێت كە ئەو شتەی شـۆڕ بووەتەوە پەتە و مـار نی‌یـە. ئیـتر گاڵتـە بـە وەهم و شڵەژانی زەینی خۆی دەكات!

ئـەم نەخۆشـی‌یە وەهمی‌یـەش هـەر بـەم جۆرەیـە، ئەگـەر درێـژە بكێشـێت دەبێت بە نەخۆشیی ڕاستەقینە.

وەهـم و گومـان لای كەسـانی هەسـت ناسـك دەبـن بـە نەخۆشـی‌یەكی سەخت و، بە دەردێكی گەورەی دەزانـن و، شتی بچووك گـەورە دەكـەن و، ورەیـان دەڕووخێـت. بـە تایبـەت ئەگـەر تووشی نیمچە پزیشـكی دڵ ڕەق و دوور لـە بـەزەیی و بـێ ویـژدان بـبن لەوانـەی كـە وەهمـەكانی نـەخۆش دەورووژێنن و لە پێش چـاویدا گـەورەی دەكەن، تاكو گیرفانی ئەو نەخۆشە گەر دەوڵەمەند بێت - دابتەكێنن، یان ژیریشـی پـێ دەدۆڕێنن و بـە تـەواوی تەندروستیی لەدەست دەردەكەن!

## دەرمانی بیست و یەكەم

ئەی برای نەخۆشم!

ڕاستە نەخۆشی‌یەكەت ئازارێكی مـاددیی هەیـە، بـەڵام لـە هـەمان كـاتدا و بەهۆی ئەم نەخۆشی‌یەتەوە چێژ و لەزەتێكی مەعنەویی هێنـدە گرنـگ دەورەی داویـت كـە هـەموو ئاسـەواری ئـازارە ماددی‌یەكـەت دەشـواتەوە و لـەناوی دەبات..

چونکە هەرگیز ئازارەکەت ناگاتە ئاستی ئەو سۆز و بەزەییەی کە لە منالّی‌یەوە لە بیرت چووەتەوە و ئێستا سەرلەنوێ کانی‌یەکەی لە دڵ و دەروونی دایك و باوك و کەسانتدا تەقیوەتەوە، ئەگەر دایك و باوك و کەسانت مابن. ئەوەتا لەم کاتەدا ئەو هەست و سۆزی خۆشەویستی و بەزەییە شیرینەی دایك و باوکت دەکەوێتەوە یاد کە لە دەمی منالّیتدا ئاراستەت دەکران و ئێستا سەرلەنوێ تازە بوونەتەوە و، خزمانت جارێکی تر هەمان بەزەیی و خۆشەویستیی جارانت بۆ دەردەبڕن و کێشی نەخۆشی‌یەکەت سۆزی خۆشەویستیی ناو دڵ و دەروونی ئەوانی ڕاکێشاوە و بە دەور و پشتتدا دێن و خەمی تۆیانە!

ئیتر دەبێ ئەو ئازارە ماددی‌یەی کە پێوەی دەتلێیتەوە، بەرامبەر بەو خزمەتگوزاری‌یەی کە ئاوێتەی سۆز و بەزەییە چ نرخێکی هەبێ!

ئەو کەسانەی کە تۆ پێشتر بە شانازی‌یەوە تێدەکۆشایت بۆ خزمەت کردنیان، وا ئێستا بەهۆی نەخۆشی‌یەکەتەوە ئەوان بەوپەڕی بەزەیی و میهرەبانی‌یەوە خزمەتت دەکەن و، تۆ لەم کاتەدا وەك گەورە و فەرماندەیەکی ئەوانت لێ هاتووە و لە فەرمانت دەرناچن! هەر بەهۆی نەخۆشی‌یەکەتەوەیە کە چەندین خۆشەویستی یاریدەدەر و هاوڕێی بەسۆز و میهرەبانی نوێت پەیدا کردووە کە لەبەر ئەو سۆز و بەزەییەی خوای گەورە لە مرۆڤدا داینـاوە نزیکیان دەخەیتەوە لە خۆت.

وێڕای ئەمەش، تۆ بەهۆی نەخۆشی‌یەکەتەوە پشوویەکی باشت دەست کەوتووە و ئێستا لە کاروبار و ئازاری فەرمانبەرێتیی ژیان و گیرو گرفتەکانی دوور کەوتوویتەوە.

جا دوای ئەوەی کە تامی ئەم هەموو لەزەتە مەعنەوی‌یانەت چەشت، کە لەم نەخۆشی‌یەوە بەدەستت هێناون، ئەوا نابێت ئازارە جوزئی و

بچووکەکەت سکاڵا لەسەر زارت دەربڕیت، بەڵکو دەبێ شوکرانەی ئەم چێژ و لەزەتە مەعنەوی‌یانە پێشکەش بکەیت.

## دەرمانی بیست و دووهەم

ئەی ئەو نەخۆشەی کە گیرۆدەی نەخۆشی‌یەکی سەختی وەك "شەلەل" بووە!

لە سەرەتاوە من مژدەت دەدەمێ کە "شەلەل" بە یەکێك لە نەخۆشی‌یە پیرۆزەکان دادەنرێت بۆ مرۆڤی باوەڕدار!

ماوەیەك دەبێ ئەمەم لە ئەولیا و پیاوچاکان بیستووە، بەڵام نهێنی‌یەکەیم نەدەزانی. وا ئێستا یەکێ لە نهێنی‌یەکانی ئەمەم بە دڵدا هات، کە بریتی‌یە لەوەی: "ئەولیاکان" بە ویستی خۆیان و بە مەبەستی گەیشتن و شادبوونیان بە خوای گەورە و ڕزگاربوونیان لە مەترسی‌یە مەعنەوی‌یەکانی دنیا و دەستەبەرکردنی بەختەوەریی هەمیشەیی دوارۆژیان، شوێن دوو بناغەی بنەڕەتی کەوتوون.

ئەو دوو بناغەیەش:

یەکەمیان: "یاد و بیری مردن"ە. واتە لە پێناوی بەدەستهێنانی بەختەوەریی هەتاهەتایی دوارۆژیاندا بیریان لە نەمان و تیاچوونی دنیا کردووەتەوە و، سەرنجیان داوە کە لە دنیادا میوانێکی ڕێبوارن و ئەو ماوەیە لە چەند کار و ئەرکێکی کاتیدا دەخرێنە کار.

دووهەمیان: مراندنی دەروونی فەرماندەری خراپکاری‌یە (النفس الأمارة بالسوء). ئەمەش لە ڕێی موجاهەدە و وەرزشی ڕۆحی‌یەوە، تاکو لە شووم و مەترسی‌یەکانی دەروون و، ئەو هەست و نەستانەش کە پاشەڕۆژ نابینن، ڕزگاریان ببێت.

دەسا ئەی ئەو برایەی کە نیوەی تەندروستیی خۆی لەدەست داوە!

خوای گەورە – بە بێ ویستی خۆت – ئەو دوو بناغە کورت و ئاسانەی لە تۆدا داناوە کە ڕێگای ئەوەت بۆ تەخت و ئاسان دەکەن بە بەختەوەریی هەتاهەتایی شاد بیت و، هەمیشە تەواوبوونی دنیا و لەناوچوونی ئادەمیزادت دەخەنەوە یاد. ئیتر، دوای ئەمە، "دنیا" ناتوانێت تەنگەنەفەست بکات و بتخنکێنێت و، بێ ئاگاییش پرکێشیی ئەوە ناکات کە پەردە بەسەر چاوەکانتدا بهێنێت. چونکە "دەروونی بەدخواز" ناتوانێت بەهۆی ئارەزووە نزمەکانیەوە کەسێکی نیوە ئادەمیزاد بخەڵەتێنێت.

ئیتر ئەو مرۆڤە بە زوویی لە شەڕ و فرت‌وفێڵەکانی ئەو دەروونە ڕزگاری دەبێت. ئیمانداریش – بەهۆی نهێنیی ئیمان و تەوەککول و ملکەچ بوونی بۆ فەرمانی خوای گەورە – بە ماوەیەکی کورت و لە ئازارێکی سەختی وەك "شەلەل"دا هێندە سوودی دەست دەکەوێت کە بە ئەندازەی ئەو سوودە بێت دەست تێکۆشەرانی ئەهلی ویلایەت و وەرزشکارانی ڕۆح دەکەوێت لەناو خەڵوەتگاکاندا. دیارە ئەو کاتەش – لەبەر ئەو سوودانە – ئازارەکەی خۆی لە بەرچاودا کەم دەبێتەوە.

## دەرمانی بیست و سێهەم

ئەی نەخۆشی نامۆ و تەنیا و دەستەوسان!

ئەگەر، سەرباری نەخۆشی‌یەکەت، نامۆییت و نەبوونی چاودێر و سەرپەرشتیکار لەم نەخۆشی‌یەتدا، سەرنجی دڵە ڕەقەکانی جووڵاندبێت و میهرەبانی و بەزەیی ئەوانی بۆ لای تۆ ڕاکێشابێت، دەبێ ڕوانینی سۆز و بەزەیی پەروەردگاری میهرەبانت چۆن بێت کە لە سەرەتای سوورەتەکانی قورئاندا بە سیفەتی مەزنی: "الرحمن الرحیم" خۆیت پێ دەناسێنێت و، تەنها

بە بریسکانەوەیەکی بەزەیی و میهرەبانیی دەراسای خۆی سەرجەمی دایکان دەخاتەکار لە خزمەتگوزاری و پەروەردەی ساوایاندا؟

ئەو خوایەی کە تەنها بە درەوشانەوە و پیشاندانی چمکێکی میهرەبانیی خۆی لە هەموو وەرزێکی بەهاردا سەرانسەری ڕووی زەوی دەڕازێنێتەوە و، لە هەموو جۆرە زۆر و زەبەندە و ڕەنگینەکانی چاکە و نیعمەت و بەخششی خۆی پڕی دەکات و، تەنها بە درەوشانەوەیەکی میهرەبانی‌یەکەشی بەهەشتی بەرین - بە هەموو جوانی و ڕازاوەییەکی - بەرجەستە دەبێت..

تۆ بەهۆی ئیمانەکەتەوە پەیوەندیت بەو خوایەوە کردووە و ناسیوتە و، بە زمانی حالی دەستەوسانیت - کە لە نەخۆشی‌یەکەتەوە سەرچاوەی گرتووە - پەنای بۆ لا دەبەیت و لێی دەلالێیتەوە و هانای بۆ لا دەبەیت. خۆ هەموو ئەمانەش نامۆیی و نەخۆشی و تەنیاییەکەت دەگۆڕن بە هۆکاری ئاوڕ لێدانەوەی سۆز و میهرەبانیی ئەو خوایە و، کارێك دەکەن کە خواوەند بە چاوی میهر و بەزەییەوە بۆت بڕوانێت، ئەو ڕوانینەی کە هەموو شتێك دەهێنێت!

خۆ مادەم خواوەند هەیە و بە چاوی سۆز و میهرەبانی‌یەوە بۆت دەڕوانێت، ئەوا هیچ خەمێکت نەبێت و، دڵنیابە کە هەموو شتێکت هەیە! تەنیا و نامۆی ڕاستەقینەش ئەو کەسەیە کە پەیوەندیی ئیمان و ملکەچیی بەو خوایەوە نەبێت، یان هەر گوێ بەو پەیوەندی‌یە نەدات!

## دەرمانی بیست و چوارەم

ئەی ئەو کەسانەی چاودێریی مناڵانی بێ گوناهی نەخۆش و ئەو پیر و پەککەوتانە دەکەن کە لە ڕووی دەستەوسانی و لاوازی‌یەوە وەکو منالّیان لێ هاتووە!

دڵنیا بن کە بازرگانی‌یەکی بەپیت و گرنگی سەر بە ڕۆژی دواییتان لە بەردەستدایە. دەسا فریای بکەون و سوودی لێ وەربگرن و بە شەوق و کۆششێکی زۆرەوە هەوڵ بدەن لە دەستان دەرنەچێت!

نەخۆشی‌یەکانی منالە بێ گوناهەکان لە ڕاستیدا بریتین لە دەرزی لێدانی پەروەردەی خوایی بۆ ئەو منالآنە کە دەمارە نەرمونیانەکانی ئەوانی پێ تونـدوتۆڵ دەکات بۆ ڕاهێنان و بەرگەگرتنی گیروگرفتە سەختەکانی دوارۆژی ژیان..

لە هەمان کاتدا ئەو نەخۆشی‌یانە چەند دانست و سوودێکیان بۆ ژیانی دنیایان و ژیانی ڕۆحی‌یان تێدایە.

واتە هەروەك نەخۆشی ژیانی مرۆڤە گەورەکان خاوێن دەکاتەوە و دەبێت بە کەفارەتی گوناهەکانیان، بە هەمان جۆر ژیانی ئەو منالآنەش پالفتەیەکی مەعنەوی دەکات.

ئەم دەرزی لێدانە مەعنەوی‌یانە بۆ منالآن، بناغەی بەرزبوونەوەی پلە مەعنەوی‌یەکانە بۆ پاشەڕۆژی ئەم دنیایان، تەنانەت هی دوارۆژی قیامەتیشیان.

پاداشتی چاودێری کردنی نەخۆشیی ئەم منال و ساوایانەش لە لاپەڕەی کردەوە چاکەکانی دایك و باوکدا دەنووسرێت، یاخود هەر لە لاپەڕەی کردەوەکانی دایکدا، چونکە وەك لای ئەهلی حەقیقەت چەسپاوە دایك - بەهۆی نهێنیی شەفەقەت و میهرەبانی‌یەوە - تەندروستیی منالەکەی گەلێ پێ باشتر و لە پێشترە لە هی خۆی!

سەبارەت بە چاودێری و خزمەتکردنی پیر و پەککەوتەکانیش، ئەوا لە چەند ڕیوایەتێکی صەحیح و چەند ڕووداوێکی مێژووییەوە دەرکەوتووە کە

چاودێرییان – بە تایبەتی دایك و باوك – و دڵ خۆشكردن و خزمەتكردنیان بەوپەڕی وەفا و دڵسۆزی، سەرباری ئەوەی كە هەموو ئەمانە مایەی دەستكەوتنی پاداشتی زۆر و دەستخستنی دوعا و نزایانە، بە تایبەت دوعای دایك و باوك.. جگە لەمەش، مرۆڤ دەگەیەننە بەختەوەریی هەردوو دنیا.

ئەو منالّ و نەوە گوێڕایەڵەی كە لەم چەشنە حاڵانەدا خزمەتی دایك و باوكی پەككەوتەی دەكات و ڕەزامەندیی دڵیان بەدەست دەهێنێت، خۆیشی لە كاتی پیریدا هەمان گوێڕایەڵی لە منالّ و نەوەكانیەوە دەبینێت و لەو دەمەدا فریای دەكەوێت..

بەڵام ئەو منالّەی دڵی دایك و باوكی تەنگ دەكات و ئەشكەنجەیان دەدات، وێڕای سزای دواڕۆژی ئەودنیا، هەر لەم دنیاشدا دووچاری گەلێ گیروگرفتی زۆر دەبێت.

بەڵێ، مەرج نی‌یە چاودێریی ئەو پیر و پەككەوتە و منالّ و ساوایانە تەنها لەبەر ئەوە بێت كە خزم و كەسوكاری ئەو كەسە بن خزمەت و چاودێری‌یان دەكات، بەڵكو یەكێك لە خواستە گرنگەكانی ئایینی ئیسلام ئەوەیە كە هەر كاتێ مرۆڤی باوەڕدار تووشی پیرێكی نەخۆشی موحتاج و شایانی ڕێز بوو، دەبێ بەوپەڕی لێبڕان و دڵسۆزی‌یەوە خزمەتی بكات و دڵی بداتەوە، مادەم برایەتیی ڕاستەقینەی موسڵمانانە لە ئارادا بێت!

## دەرمانی بیست و پێنجەم

ئەی برایانی نەخۆش!

ئەگەر هەست دەكەن بەوەی كە پێویستتان بە چارەسەرێكی خاوێن و بەسوود و بە دەرمانێك هەیە كە لەزەتی ڕاستەقینەی تێدا بێت و، بۆ چارەسەر

کردنی هەموو دەردێك دەست بدات، ئەوا تا دەتوانن ئیمانەکەتان بەهێز وخاوێن و درەخشان بکەن! واتە بەهۆی تەوبە و لە خوا پاڕانەوە و نوێژ و پەرستشەوە هێزوپێز بە ئیمانەکەتان بدەن و، ئەو چارەسەرە خاوێن و قودسی‌یە بەکاربهێنن.

ئەو کەسانەی کە بەهۆی خۆشەویستیی دنیا و دەستگرتنیان بە داوێنیەوە دووچاری بێ ئاگایی هاتوون، دەڵێی جەستەیەکی مەعنەویی بیماری بە ئەندازەی دنیایان لەخۆیاندا هەڵگرتووە!

لەم کاتەدا ئیمان دێت بە هانایانەوە و، دەرمان و چارەسەری شیفابەخشی خۆی پێشکەش بەو جەستەیە دەکات کە بە مشتەکۆڵە ئازاربەخشەکانی جودایی و نەمان زامدار بووە و، لەو برین و زامانە ڕزگاری دەکات.

لە چەندین پەیامدا چەسپاندوومانە کە "ئیمان" شیفای ڕاستەقینە دەبەخشێت. جا لەبەر ئەوەی درێژە بە باسەکە نەدەین، ئەوا بە پوختی و کورتی دەڵێم:

کاریگەریی چارەسەرە ئیمانی‌یەکان کاتێ دەردەکەوێت کە بەپێی توانا "فەرزەکان" بەجێ بهێنرێن و چاودێری بکرێن. بە پێچەوانەشەوە: (بێ ئاگایی و، هەرزەیی و، شوێنکەوتنی ئارەزووی دەروون و، گاڵتەوگەپی ناڕەوا) کاریگەریی ئەو چارەسەرانە لا دەبەن.

خۆ مادەم نەخۆشی پەردەی بێ ئاگایی لا دەبات و، ئیشتیهای دەروون ناهێڵێت و، ڕێ لە چوونە ژوورەوەی لەزەتە ناڕەواکان دەگرێت، ئەوا ئێوەش ئەمە بە هەل بزانن و سوودی لێ وەربگرن و، بە تۆبە و داوای لێبوردن و پاڕانەوە و ئومێد پەیدا کردن بە "میهرەبانیی خوا" چارەسەرەکانی ئیمانی ڕاستەقینە و ڕووناکی‌یە قودسی‌یەکانی بەکاربهێنن.

لـە خـوای گـەورەی میـهرەبان دەپاڕێمـەوە کـە شـیفاتان پێ ببەخشـێت و نەخۆشییەکانتان بۆ بکات بە کەفارەتی گوناهەکانتان.

ئامین.. ئامین.. ئامین.

﴿وقالوا الْحَمْدُ للهِ الَّذِي هَدانا لِهذا وَمَا كُنَّا لِنَهْتَدِيَ لَوْلا أَنْ هَدانا اللهُ لَقَـدْ جاءَتْ رُسُلُ رَبِّنا بِالْحَقِّ﴾.

﴿سُبحانَكَ لا عِلْمَ لنا إِلاّ ما علَّمْتَنا إِنَّكَ أَنْتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ﴾.

اللّهم صل على سيدنا محمد:

طب القلوب ودوائها..

وعافية الأبدان وشفائها..

ونور الأبصار وضيائها.

وعلى آله وصحبه وسلم.

* * *

پاشكۆی یەكەمی پەیامی بیماران
بریسكەی دووهەم لە كتێبی (بریسكەكان)

# لەگەڵ پێشەوای ئارامگراندا

بسم الله الرحمن الرحیم

﴿وَأَيُّوبَ إِذْ نَادَى رَبَّهُ أَنِّي مَسَّنِيَ الضُّرُّ وَأَنْتَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ﴾ (الأنبیاء:٨٢)

ئەم نزا و پاڕانەوەیەی پێشەنگی ئارامگران حەزرەتی ئەییووب - دروودی خوای لەسەر بێت - تاقی كراوەیە و، كاریگەری‌یەكی تەواو بەسوودی هەیە. پێویستە ئێمەش لە مونا‌جات و پاڕانەوەكانماندا سوود لە نووری ئەم ئایەتە پیرۆزە وەربگرین و بڵێین:

رب ﴿أَنِّي مَسَّنِيَ الضُّرُّ وَأَنْتَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ﴾!

چیرۆكی بەناوبانگی حەزرەتی ئەییووب - دروودی خوای لەسەر بێت - بە پوختی بەم جۆرەی خوارەوە بووە:

ئەم پێشەوا ئارامگرە، ماوەیەكی درێژخایەن ئارامی لەسەر نەخۆشی‌یە قورسەكەی گرت، بە ڕادەیەك كە زام و برین هەموو ئەندامەكانی جەستەی گرتەوە، كەچی لەگەڵ ئەوەشدا هەر لەسەر ئارامگرتن بەردەوام بوو، چونكە چاوەڕوانی پاداشتە مەزنەكەی خوای گەورە و بەتوانای دەكرد. بەڵام كاتێ ئەم نەخۆشی‌یە پتر پەرەی سەند و كرم دایە "دڵ" و "زمان"ی، كە تەنها بەم دوانەش خوا دەناسرێت و یادی ئەوی پێ دەكرێتەوە، ئا لەم كاتەدا هانای

بردە بەر خواوەندی میهرەبان و ئەو موناجاتە نەرم و پاك و خەمناكـەی كـرد و فەرموی:

﴿أَنِّي مَسَّنِيَ الضُّرُّ وَأَنْتَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ﴾!

ئەمەش تەنها لە ترسی ئەوەی كە ئیتر نەتوانێت بە تـەواوەتی پەرستشـەكانی جێبەجێ بكـات و، كـەموكووڕی ڕوو بكاتـە بەندایەتییـەكانی، نـەك بـۆ مەبەستی چاكبوونەوە و حەوانەوەی خۆی. ئەوەبوو یەكسەر خوای گەورەی میهرەبان ئەو پاڕانەوە پاك و نزا بێگەردەی بە شێوەیەكی دەراسا(معجز) گیرا كرد و شیفای تەواوی پێ بەخشی و نیعمەتی خۆی بەسەردا باراند.

ئەم بریسكەیە پێنج سەرنجی وردی تێدایە:

❐ سەرنجی یەكەم:

لە بەرامبـەر زامـە دیار و بـەرچاوەكانی حـەزرەتی ئەییووبـەوە - درودی لەسـەر بێـت - ئێمـە گیرۆدەی چـەندین ئـازار و زام و نەخۆشـیی مەعنـەویی نادیـارین كـە لـە "گیـان" و "دڵ"مـاندا دروسـت بـوون. ئـەو نەخۆشـییە مەعنەوییانەش لە ڕادەیەكی وادان كـە ئەگـەر دیوی ناوەوەمـان بۆ دەرەوە و دەرەوەشمـان بۆ نـاوەوە هەڵبگێڕینـەوە، ئـەوا دەردەكـەوێت كـە ئێمـە زۆر لـە حەزرەتی ئەییووب زیاتر لەش بەبار و گیرۆدەی زام و نەخۆشییەكانین!

چونكە ئەو هەموو گوناهانەی دەیانكەین و، ئەو شـوبهە و گومانانـەش كـە خۆیان دەگەیەننە مێشك و دڵ و دەروونمان، چەندین زامی قووڵ و خوێنـاوی لە ناخی "دڵ" و "گیان"ماندا والآ دەكەن.

ئنجا لە لایەكی تریشەوە، زام و برینەكانی حەزرەتی ئـەییووب - درودی خوای لەسەر بێت - تەنها ژیـانی كـورت و كـەم خایـەنی ئەم دنیایـەی ئـەوی خستبووە مەترسییەوە، كەچی زامـە مەعنەوییـەكانی ئێمـە ژیـانی هەمیشـەیی ئەودنیامان دەخاتە مەترسییەوە!

کەواتە ئێمە چەندین جار زیاتر لەو پێغەمبەرە مەزنە - دروودی لەسەر بێت - پێویستمان بە موناجاتەکەیەتی. بە تایبەتی ئەگەر بزانین کە لە بریی ئەو کرمانەی لە برینەکانی ئەو پێغەمبەرە ئارامگرەوە سەریان کرد و دابوویانە دڵ و زمانی، ئێمە چەندەها گومان - کە لە زامە مەعنەوی‌یەکانمان و گوناهـ و کردەوە خراپەکانمانەوە پەیدا بوون - ناخی "دڵ"ی داگیر کردووین، کە مەڵبەند و نیشتەجێی "ئیمان"ە! بۆیە ئیمانەکەمان جێی پێ لێژ دەبێت و لەسەر ئارامی و دڵنیایی خۆی نامێنێتەوە..

هەروەها ئەو گومان و دوودڵی‌یانە خۆیان دەگەیەننە "زمان"مان، کە ئیمانی ناو دەروونمان دەردەبڕێت. ئیتر خۆشی و چێژ و لەزەتی ئیمانی لێ دەسێنێتەوە و دووری دەخاتەوە لە یاد و ناوبردنی خوای گەورە، تا بە جارێ کپ و بێ دەنگی دەکات!

بەڵێ، گوناهـ لە ناودڵدا جێی خۆی دەکاتەوە و لق و پەل بۆ ناو قووڵایی دڵ دەهاوێت و، لەوێوە دەست بە بڵاوکردنەوەی لەکە و تاریکاییەکانی خۆی دەکات و، ئیمانی لێ دەردەهێنێت. ئیتر ئەو دڵە وەك بەرد ڕەق دەبێت و، چۆڵ و تاریك دادێت.

جا لەبەر ئەوەی هەموو خراپکاری و گوناهێك ڕێگایەکی بەرەو کافربوون لێ دەبێتەوە، ئەوا گەر لە سەرەتاوە بە پەشیمان بوونەوە و داوای لێبووردن لە خوای گەورە ئاسەوارەکانی ئەو گوناهە لا نەبرێت و پاك نەکرێتەوە، ئەوا دوایی لە ناخدا دەبێت بە کرمێکی مەعنەوی یاخود مارێکی مەعنەوی و بە دڵی مرۆڤەوە دەدات!

با ئەوەش بەم نموونەیەی خوارەوە ڕوون بکەینەوە:

ئەگەر کەسێك بە دزی‌یەوە گوناهێك ئەنجام بدات و شەرمیش لەوە بکات کە پێی بزانرێت، ئەم مرۆڤە بوونی مەلائیکەت و جیهانی ڕۆحانیی

بەلاوە گران دەبێت و، تەنها نیشانە و بیانوویەكی بێ نرخی بەلاوە سەروزیادە بۆ ئەوەی حەزی خۆی دەربڕێت كە دان بە بوونیاندا نەنێت!

نموونەیەكی تر:

ئەو كەسەی گوناهێكی هێندە گەورە بكات كە بەرەو دۆزەخ بیداتەبەر، ئەگەر پەنا بۆ خوای گەورە نەبات و داوای لێبوردنی لێ نەكات و پشتی پێ نەبەستێت، ئەوا لە كاتی بیستنی ئازار و ناخۆشییەكانی دۆزەخدا، لە ناخی دەروونەوە حەز بە نەبوونی دۆزەخ دەكات! تا لە ئەنجامدا وای لێ دێت كە بە ئاسایی ترین نیشانە، یان بە شوبهە و گومانێكی بێ نرخ، پڕكێشیی نەسەلماندنی بوونی دۆزەخ بكات!

نموونەیەكی تر:

ئەو كەسەی فەرزەكان بەجێ ناهێنێ و وەك پێویست فەرمانی بەندایەتی بۆ خوای گەورە ئەنجام نادات، لە هەمان كاتدا دڵی لە سەرزەنشتی فەرماندەیەكی ئاسایی ئازار دەچێژێت كە لە بەرامبەر بەجێ نەهێنانی فەرمانێكی ئاساییەوە ئاراستەی كردبێت.. سستی كردنی ئەو كەسە لە بەجێهێنانی ئەو فەرزانەی كە لە چەندین فەرمانی خوای گەورەدا بۆی دەركراوە، دڵتەنگی و تاریكییەكی یەكجار زۆر لە "گیان" و "دەروون"یدا دروست دەكات..

ئەم دڵتەنگییەش پاڵی پێوە دەنێت كە هەروەك لە دەروونەوە ئارەزوو دەكات، پڕ بە دەمیش هاوار بكات و بڵێت: "خۆزگە خوای گەورە فەرمانی بە كردنی ئەو پەرستشە نەدایە"! دیارە ئەو ئارەزووەش بۆنی ئینكاری و دوژمنایەتییەكی مەعنەویی لێ دێت بەرامبەر بە خوایەتیی خوای گەورە. هەر لەبەر ئەوەشە كە ئەگەر بێ نرخترین گومان لە بارەی بوونی خواوەندەوە ڕوو بكاتە ئەو دڵە، حەزی پێ دەكات. وەك بڵێی بەڵگەیەكی گومان بڕی

دەست کەوتبێت! ئاشکرایە کە بەم کارەی دەرگایەکی گەورەی زەرەرمەندیی لە ڕوودا والاّ دەبێت..

بەڵام ئەم بەدبەختە بەخۆی نازانێت کە بەم ملنەدان و نکوولی کردنەی، خۆی کردووە بە نیشانە بۆ تیری دڵتەنگی و تاریکیەك ملیۆنەها جار لەو دڵتەنگی‌یە کەمەی لە ئەنجامی سستی کردنی لە بەندایەتیدا هەستی پێ دەکرد گەورەتر و تاریکتر بێت. وەکو ئەو کەسەی کە لە پێوەدانی مێشوولە هەڵبێت و لەتاوا خۆی بخاتە بەردەمی مار و هەژدیهاکان!

جا با لە ڕۆشنایی ئەم سێ نموونەیەدا، لە نهێنیی ئەم ئایەتە پیرۆزە تێبگەین کە دەفەرموێ:

﴿بَلْ رانَ عَلى قُلُوبِهِمْ مَا كانُوا يَكْسِبُونَ﴾ (المطففين:١٤).

❑ سەرنجی دووهەم:

هەروەك لە وتەی بیست و شەشەم، لە باسی نهێنیی قەدەری خوای گەورەدا، ڕوون کراوەتەوە:

مرۆڤ – لە سێ ڕووەوە – مافی سکاڵای نی‌یە لە دەست ئەو بەلا و نەخۆشی و گیروگرفتانەی کە دێنە ڕێی ژیانی:

○ *ڕووی یەکەم:*

خوای گەورە کاتێ بەرگی "بوون"ی بە بەری مرۆڤ پۆشیوە، کردوویەتی بە بەڵگە لەسەر وردەکاریی سنعەت و دروستکراوانی خۆی و، مرۆڤی لە شێوەی نموونەیەکیشدا بەدی هێناوە کە بەرگی "بوون"ی بە بەر دەبڕێت و دەستکاری و ئاڵوگۆڕ لەو بەرگەدا دەکات. بەمەش درەوشانەوە جۆراوجۆرەکانی ناوە جوانەکانی خۆی لە بوونەوەردا پیشان دەدات.

جا هەروەك ناوی "الشافي"ی خواوەند داخوازی بوونی نەخۆشی‌یە، بە هەمان جۆر ناوی "الرزاق"یش داخوازی بوونی برسێتی‌یە.. بەم جۆرە

دەردەکەوێت کە خوای گەورە خۆی خاوەنی موڵکی بوونەوەرە و بە ویستی خۆی دەستکاری و ئاڵوگۆڕ لە موڵکەکانیدا دەکات.

○ *ڕووی دووەمم:*

"ژیان" بەهۆی گیروگرفت و بەڵا و موسیبەتەکانەوە پاڵفتە دەبێت و، لە ڕێی نەخۆشی و کارەساتەکانەوە پاك دەبێتەوە و بەروبووم دەبەخشێت و دەگاتە ئامانجەکانی. ئیتر لەم ڕێگایەوە دەتوانێت ئەرکی خۆی جێبەجێ بکات.

بەڵام ئەو ژیانە ئاساییەی کە لەسەر یەك ڕەوت و شێوە و بە بێ هیچ ئاڵوگۆڕێك و بە خۆشی و حەوانەوە لە مرۆڤ دەچێتە سەر، گەلێ نزیکە لەو "نەبوون"ەی کە شەڕ و خراپەیەکی ڕوون و ئاشکرایە، تا ئەو "بوون"ەی کە خێر و فەڕێکی ئاشکرا و لەبەرچاوە. تەنانەت ئەو جۆرە ژیانە ڕێگایەکە بۆ ڕۆشتن بەرەو نەبوون.

○ *ڕووی سێهەم:*

دنیا تەنها خانەی تاقیکردنەوەیە، واتە جێی ئەنجامدانی کردەوە و پێشکەش کردنی عیبادەتە، نەك جێی خۆش گوزەرانی و حەسانەوە و پاداشت وەرگرتن..

لەبەر ئەوە، هەموو نەخۆشی و گیروگرفت و موسیبەتێك، بە مەرجی ئارامگرتن و شوکرانەبژێری - جگە لەو گیروگرفتانەی ڕوو دەکەنە ئایین - زۆر لەگەڵ ئەو کردەوە و عیبادەتانەدا گونجاوە، چونکە یارمەتیی ئەو کردەوە و پەرستشە دەدات و پشتی دەگرێت. هەر لەبەر ئەوەشە کە سکاڵا کردن لە دەست ئەو نەخۆشی و گیروگرفتانە بە کارێکی هەڵە و نابەجێ دادەنرێت، بەڵکو دەبێ شوکرانەیان لەسەر بکرێت، چونکە ئەو

نەخۆشی و گیرو گرفتانە هەموو سەعاتێکی ژیانی خاوەنەکانیان دەکەن بە پەرستشی ڕۆژێکی تەواوەتی.

بەڵێ، پەرستش دوو جۆرە: جۆرێکی بە ئەندامەکانی لەش ئەنجام دەدرێت و، جۆرەکەی تریشی بە "دڵ".

جۆری یەکەمیان لای هەموان ئاشکرا و زانراوە..

جۆری دووهەمیش ئەوەیە کە: نەخۆشی و گیرو گرفتەکان دەستەوسانی و لاوازیی مرۆڤ بە نەخۆشەکە دەناسێنن، خۆ کە هەستیشی بە "لاوازی" و "دەستەوسانی"ی خۆی کرد، ئەوا پەنا دەباتە بەر سۆز و میهرەبانیی خوای گەورە و ڕووی تێدەکات و پشتی پێ دەبەستێت. بەمەش پەرستشێکی پاك و بێگەردی پێشکەش دەکات. ئەم جۆرە پەرستشە گەلێ خاوێنە و هەرگیز ڕیای تێکەڵ نابێت.

جا ئەگەر ئەو مرۆڤەی کە دووچاری گیرو گرفت و نەخۆشی دەبێت، ئارام بگرێت و بیر لە پاداشتە زۆرەکەی لای خوای گەورە بکاتەوە و شوکرانەبژێر بێت، ئەوا هەموو سەعاتێکی ژیانی بۆ دەبێت بە عیبادەتی ڕۆژێکی تەواوەتی. بەم جۆرە، تەمەنە کەم و کورتەکەی بۆ دەبێت بە تەمەنێکی دوور و درێژ. بەڵکو هەندێکیان هەموو خولەکێکی ژیانیان بۆ دەبێت بە پەرستشی ڕۆژێکی تەواوەتی.

کاتی خۆی زۆر بەزەییم بە "حافز ئەحمەدی موهاجیر"دا دەهاتەوە، کە یەکێك بوو لە برایانی ئاخیرەتم. چونکە بە نەخۆشییەکی سەختەوە دەتلایەوە. پاشان ئەم ختوورەیەم بە دڵدا هات کە: (مزگێنیی بدەرێ و پیرۆزبایی لێ بکە، چونکە هەموو خولەکێکی ژیانی، کە بەو جۆرە لێی دەگوزەرێت، بە پەرستشی ڕۆژێك بۆی دەژمێررێت)!

لە ڕاستیشدا هەمیشە ئارامگر و شوکرانەبژێر بوو.

❏ سەرنجی سێهەم:

هەروەك لە "وتەكان"ی پێشوودا ڕوونمان كردووەتەوە:

ئەگەر هەر مرۆڤێك بیر لە ڕابوردووی ژیانی خۆی بكاتەوە، ئەوا چ بە دڵ و چ بە زمانی دەڵێت: "داخی بە جەرگم".. یاخود دەڵێت: "سوپاس بۆ خوا"! واتە یان زۆر لە داخی ژیانی ڕابوردوویدایە، یاخود سوپاسی خوای گەورەی لەسەر دەكات.

جا ئەو كەسەی كە داخی ژیانی ڕابوردووی لە دڵدایە و لە زمانیەوە ئەم خەم و پەژارەیەی دەردەكەوێت، هۆكەی تەنها لەدەستچوونی ژیانی شادمانی و خۆشحاڵیی كاتەكانی پێشوویەتی، چونكە لەدەستچوونی خۆشی - خۆی لە خۆیدا - ناخۆشی و ئازارە. بەڵكو كاتی وا دەبێت خۆشی و چێژێكی كەم، ئازارێكی زۆر و بەردەوام لە دڵدا بەجێ دەهێڵێت. جا بیركردنەوەی مرۆڤ لە خۆشییەكانی ژیانی ڕابوردووی - بێ هیچ گومانێك - دڵی دەگووشێت و خەفەت و ئازار لەسەر زمانی دەچۆڕێنێت..

بەڵام ئەو چێژە مەعنەوییە بەردەوامەی كە مرۆڤ لە نەمانی ئازارەكانی ڕابوردوویەوە هەستی پێ دەكات، زمانی دەخاتە شوكرانەبژێریی خوای گەورە.

ئەمەش حاڵەتێكی سروشتییە و هەموو مرۆڤێك بۆ خۆی هەستی پێ دەكات.

ئەو كەسەی كە دووچاری گیروگرفت یان نەخۆشییەك دەبێت، جگە لەو چێژە مەعنەوییەی باسمان كرد، ئەگەر بیریش لەو پاداشتانەی دواڕۆژ بكاتەوە كە خوای گەورە بۆی داناوە و، سەرنج لەوەش بدات كە ژیانە پڕ لە دەردیسەرییەكەی ئێرەی لەوێ بۆی دەبێت بە ژیانێكی هەمیشەیی و درێژخایەن، ئەوا ئەو مرۆڤە تەنها بە ئارامگرتنەوە ڕاناوەستێ، بەڵكو

بەرەوژوورتر هەنگاو دەنێت و شوكرانەی لەسەر پێشكەش دەكات و بە "قەدەر"ی خوای گەورە ڕازی دەبێت. دیارە ئەو كاتەش زمانی دەكەوێتە شوكرانەبژێری و دەڵێت:

"الحمد لله علی كل حال، سوی الكفر والضلال"!

لەناو خەڵكیدا باوە كە دەڵێن:

"ژیانی دەردیسەری و پڕ لە گیروگرفت، درێژخایەنە"!

بەڵێ ڕاستە.. بەڵام نەك بەو واتایەی كە هەندێ كەس پێیان وایە بەهۆی دڵتەنگی و ئازارەكەیەوە دوور و درێژە. بەڵكو لەبەر ئەوەیە كە بە وێنەی تەمەنێكی درێژخایەن بەروبوومی گەورە و بەنرخ بۆ ژیانی مرۆڤ بەرهەم دەهێنێت!

❐ سەرنجی چوارەم:

هەروەك لە مەقامی یەكەمی وتەی بیست و یەكەمدا ڕوونمان كردووەتەوە:

ئەگەر بێت و مرۆڤ ئەو هێز و توانای ئارامگرتنەی كە خوای گەورە پێی بەخشیوە بەم لا و ئەو لادا بڵاوی نەكاتەوە و، لە ئەندێشە و ترس و خەفەتدا پەرتەوازەی نەكات، ئەوا هەر تەنها ئەو هێزە سەروزیادە بۆ ئەوەی بەرەنگاریی هەموو گیروگرفتێكی پێ بكات..

بەڵام وەهم و، بێ ئاگایی و، پشت بەستن بە ژیانی دنیا و، بە هەمیشە زانینی ئەم ژیانە، هێزی ئارامگرتنی مرۆڤ ناهێڵن و، لە نێوان ئازارەكانی ڕابوردووی و مەترسییەكانی ئایندەدا هێز و توانای مرۆڤ پەرتەوازە دەكەن. تا لە ئەنجامدا ئەو هێزی ئارامگرتنەی كە خواوەند بە مرۆڤی بەخشیوە هێندە كەم دەبێتەوە كە لە بەرامبەر هیچ بەڵا و گیروگرفتێكدا خۆی پێ ڕاگیر نەكرێت.. دەبینیت ئەو مرۆڤە لای ئەم و ئەو سكاڵا دەكات، تەنانەت هەندێ جار لای خەڵكی - خوا پەنامان بدات - سكاڵا لە دەست خوای گەورە

دەردەبڕێت! بەڵکو وەك شێتی لێ دێت و دەری دەخات کە هیچ تۆێشوویەکی ئارامی لە لا نەماوە!

ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە مرۆڤ مافی دەربڕینی ئەم چەشنە سکاڵایەی نییە، چونکە ڕۆژانی ڕابوردوو ئەگەر بە گیروگرفت و ناخۆشی ڕۆشتبنە سەر، ئەوا ئێش و ئازارەکانیشیان بەسەرچووە و، خۆشی و حەوانەوەیان جێ هێشتووە.. چونکە تەنگژەکانی بەسەرچوون و ماندووییەکانیشی ڕۆشتوون، بەڵام خێر و پاداشتەکانیان ماوەتەوە. کەوابوو نابێ سکاڵایان لە دەست بکرێت، بەڵکو پێویستە مرۆڤ شوکری خوای گەورە بکات لەسەر ئەوەی کە ئازارەکانی ڕۆشتوون و بەسەرچوون.

هەروەها کارێکی ڕاست و دروست نییە کە مرۆڤ لەدەست ئازار و بەڵا و گیروگرفتەکان بێزار بێت و ڕقیان لێ هەڵبگرێت، بەڵکو دەبێ پەیوەندیی خۆشەویستانەیان لەگەڵدا ببەستێت! چونکە ئەو ژیانەی کە بەو شێوەیە لە مرۆڤ دەڕواتە سەر، بەهۆی ئەو ئازارانەوە، دەبێت بە ژیان و تەمەنێکی درێژی ئەوتۆ کە بەختەوەریی هەمیشەیی بۆ مرۆڤ بەرهەم بهێنێت.

لەبەر ئەوە، گەر مرۆڤ بەشێکی زۆری هێزی خۆڕاگری و ئارامگرتنی خۆی لە بیرکردنەوەی ئازارەکانی پێشوویدا لەناوببات، ئەوا هەنگاوی بەرەو کرداری شێتانە ناوە!.

ڕۆژانی داهاتووش، لەبەر ئەوەی کە هێشتا نەهاتوون و نازانرێت چۆن دەبن، ئەوا بیرکردنەوە و دەربڕینی بێ تاقەتی هەر لە ئێستاوە لە دەست ئازار و گیروگرفت و ناخۆشییەکانی ئەو ڕۆژانە ڕەفتارێکی تابلێی دوور لە ژیرییە! چونکە هەروەك ئەو کەسەی کە هەر ئێستا و لە ترسی برسێتی و تینوبوونی سبەینێ و دووسبەیدا هەتا دەتوانێت گەدەی خۆی بە خواردن و خواردنەوە

دەئاخنێت، بە کەسێکی نەفام دادەنرێت، بە هەمان جۆر بیرکردنەوە و ترس و بیمیش هەر لە ئێستاوە لە دەست نەخۆشی و ئازارێکی ئایندە کە لە حوکمی "نەبوو"دایە، بە گێژی و نەفامی دەژمێررێت، بە ڕادەیەك کە ئەو کەسەی ڕەفتاری وا دەنوێنێت سەرەڕای ئەوەی ستەم لە خۆی دەکات، خۆیشی دادەبەزێنێتە ئەو ئاستەی کە هیچ کەسێك بەزەیی پێدا نەیەتەوە!

بە پوختی:

هەروەك "شوکرانەبژێری" نیعمەتی پێ زیاد دەبێت، "سکاڵاکردن"یش پەرە بە موسیبەت و گیروگرفتەکان دەدات و، خاوەنەکەی لەوە دوور دەخاتەوە کە خەڵکی بەزەییان پێدا بێتەوە.

پیاوێکی خواناسی خەڵکی "ئەرزڕۆم" لە یەکەم ساڵی جەنگی جیهانیی یەکەمدا گرفتاری نەخۆشی‌یەکی سەخت بوو. کاتێ ڕۆشتم بۆ سەرلێدانی، خەفەت و سکاڵای خۆی لە لا دەربڕیم و، وتی:

(سەد ڕۆژی ڕەبەقە خەو نەڕۆشتووەتە چاوەکانم)!

منیش زۆر بەم هەواڵە دڵگران بووم و بەزەییم بە حاڵیدا هاتەوە. پاشان ئەمەی خوارەوەم بیرکەوتەوە و، پێم وت:

(برام! ئەو سەد ڕۆژەی ڕابورد، لەبەر ئەوەی ڕۆشتوون و بەسەرچوون، جێگای دڵخۆشین. کەواتە هیچ بیرێکیان لێ مەکەرەوە و سکاڵایان لە دەست دەرمەبڕە، بەڵکو شوکری خوای گەورە بکە لەسەر ئەوەی کە تەواوی کردوون و، لەم گۆشەیەوە بڕوانە بۆ ئەو سەد ڕۆژەی ڕابوردوو!

ڕۆژانی داهاتووش، لەبەر ئەوەی کە هێشتا نەهاتوون، پشت بە خواوەند بەستە بۆیان و هەمیشە میهرەبانیی ئەو لە پێش چاوی خۆت دابنێ.. پێش ئەوەی لێت بدرێ مەگری.. لە هیچ مەترسە.. شێوە و ڕوخساری "بوون" بە "نەبوون" مەدە. بەڵکو هەموو بیر و هۆشێکت بۆ ئەم سەعاتەی ئێستای

ژیانت تەرخان بكە، چونكە هێزی سەبر و ئارامت تەنها بەشی ئەوە دەكات كە لە بەردەم ئازارەكانی ئەم كاتەتدا ڕابووەستیت. وەك ئەو سەركردە نەزانە مەبە كە هەموو هێزەكانی خۆی بەم لا و ئەولادا بلاّو كردەوە و، هێزەكانی دەستە ڕاست و دەستە چەپی دوژمنیش كە بەو دەرفەتەیان زانی وەك هەلیّك قۆزتیانەوە و یەكیان گرت و بە هێزێكی یەكجار كەمەوە هاتنە سەریان و لەناویان بردن!

برای ئازیزم! تۆ بەم جۆرە مەبە، بەڵكو هەموو هێزەكانت بۆ ئەم سەعاتەی ئێستات كۆ بكەرەوە، چاوەڕوانی میهرەبانی‌یە فراوانەكەی خوای گەورە بە و، بیر لە پاداشتی پاشەڕۆژ بكەرەوە. سەرنج لە نەخۆشی‌یەكەت بدە كە لەم دنیا براوەیەدا تووشت بووە و لە پاشاندا بۆت دەبێت بە تەمەنێكی درێژی هەمیشەیی. ئیتر لە بریی ئەم سكالاّ تاڵە، شوكرانەبژێریی دڵخۆشكەر و زۆر پێشكەشی خواوەندی گەورەی بەدەستەلاّت بكە).

كە لەم قسانەم بومەوە، ئەو مرۆڤە نەخۆشە خواناسە دڵی كرایەوە و ڕوخساری گەشایەوە و، وتی:

(سوپاس بۆ خوا! وا بەشێكی زۆری ئازارەكەم ڕۆشت و لەسەر شانم سووك بوو)!

❐ سەرنجی پێنجەم:

ئەم سەرنجە سێ مەسەلەی لەخۆ گرتووە:

◆ *مەسەلەی یەكەم:*

"موسیبەت" كاتێ بە موسیبەتی ڕاستەقینە دادەنرێت و بە ڕاستی زیانبەخش دەبێت كە ڕووی لە ئایین و باوەڕ كردبێت، كە ئەویش بەوە چارەسەر دەبێت مرۆڤ هانا بۆ لای خوای گەورە بیات و لێی بپاڕێتەوە.

بەڵام ئەو گرفت و موسیبەتانەی کە ڕوویان لە ئایین نەکردووە، لە ڕاستیدا موسیبەت نین، چونکە بەشێکیان ئاگادارکردنەوەن لە لایەن خوای گەورەوە بۆ بەندەکانی تاکو لە خەوی بێ ئاگایی بێداریان بکاتەوە، بە وێنەی ئەو ئاگادار کردنەوەیەی کە شوانەکان لە کاتی بڵاوبوونەوەی مەڕەکانیاندا بەکاری دەهێنن و بەردێکیان تێ دەگرن و، مەڕەکانیش بەوەدا دەزانن زیادەڕەوییان کردووە و، یەکسەر دەگەڕێنەوە بۆ لەوەڕگە و لای شوانەکەی خۆیان!

هەر بە وێنەی ئەم نموونەیە، هەندێ بەڵا و موسیبەتیش هەن کە دەبنە ئاگادارکردنەوەیەکی پەروەردگار بۆ بەندەکانی.

بەشێکی تریشیان دەبن بە لابەر(کفارة)ی گوناهـ و هۆی سڕینەوەی خەتاباری.

بەشێکی تریش دیارییەکی خواییە بۆ دڵدانەوە و ئارامی بەخشین بەو دڵانە، ئەمەش لە ڕێی نەهێشتن و لابردنی ئەو بێ ئاگاییەی کە تووشی مرۆڤ دێت و، لە ڕێی ئەوەشەوە کە موسیبەت و گیروگرفت وا لە مرۆڤ دەکەن هەست بە ڕادەی ئەو بێ دەستەڵاتی و دەستەوسانی و هەژارییەی خۆی بکات کە ئاوێتەی سروشتی بوون.

بەڵام ئەو موسیبەتەی کە لە شێوەی نەخۆشیدا ڕوو دەکاتە مرۆڤ - وەك لە پێشدا باسمان کرد - موسیبەتی ڕاستەقینە نییە، بەڵکو بەزەییەکی خواوەندە بۆ بەندەکانی خۆی. چونکە "نەخۆشی" مرۆڤ لە چڵکی گوناهەکان پاك دەکاتەوە، وەك لە فەرموودەیەکی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە کە دەفەرموێ:

"ما مِن مُسلمٍ يُصيبُه أذىً إلاّ حاتَّ اللهُ عنه خطاياه كما تُحــــاتُّ ورقُ الشجرِ"[1].

حـەزرەتی ئەییووب - درroodی لـەسـەر بێت - كاتـێ كـە لـە خـوا پاڕایەوە، لەبەر خۆی و بۆ مەبەستی حەوانەوەی ژیانی دنیای نەپاڕایـەوە، بەڵكو پاش ئەوەی نەخۆشییەكەی گەیشتە ڕادەیـەك كـە نەیدەتوانی بـە زمـان ناوی خوای گەورە بهێنێت و بە دڵیش یادی خوا و بیر لـە دروستكراوەكانی بكاتەوە، ئەو كاتە پەنای بردە بەر میهرەبانیی خوا و داوای چاكبوونەوەی لـێ كرد، بۆ ئەوەی بتوانێت ئەرك و فەرمانبەرێتیی بەندایەتی بە تەواوی جێبـەجێ بكات.

ئێمەش دەبێ لە پاڕانەوەكانماندا یەكەم مـەبەستمان چاكبوونـەوەی زام و برینەكانی دڵ و دەروونمان بێت كە لە گوناهباری و خراپەكارییەوە تووشمان بووە.

سەبارەت بـە نەخۆشییە ماددییەكانیشـمان، كە دەبنە كۆسپ لـە ڕێـی بەندایەتیماندا، دەبێ پەنا بۆ خوای گەورە بـەین و بـە ڕاستی لێـی بپاڕێینـەوە، بێ ئەوەی هیچ سكاڵا و وتەیەكی ناڕەوامان لە دەم دەربچێت، چونكـە مـادەم ئێمە ئەوپەڕی ڕەزامەندیمان لە پەروەردگارێتیی خوای گەورە هەیە، ئەوا دەبێ هەرشتێكیش لە لایەن خواوەندەوە بێت پێی ڕازی بـین و ملكـەچی و تەسلیم بوونی خۆمانی بۆ دەرببڕین..

بەڵام هەر سـكاڵایەك پـەلـپ و بیـانووگرتنی تێدا بێت بـە قـەزا و قـەدەری خوای گـەورە، یان داخ و خەفەتی لە بەرامبەرەوە دەرببڕێت، ئەوا وەكو ئـەوە

(١) تەخریجەكەی لە لاپەڕە (١٨)دا ڕابورد. (وەرگێڕ)

وایە کە ڕەخنە لە "قەدەری خـوا" بگرێـت و میهرەبانی‌یە زۆرەکەی تۆمـەتبار بکـات! خۆ ئاشکرایە هەرکەسێك ڕەخنـە لـە قـەدەری خـوا بگرێـت ئـەوا "قەدەر" بەسەر ئەو کەسەدا سەر دەکەوێت و، هەرکەسیش تۆمەت ئاراستەی میهرەبانیی خواوەندی میهرەبان بکات، لە سۆز و میهرەبانی‌یەکـەی بێ بەش دەبێـت! هـەروەك بـەکارهێنانی دەسـتی شـکاو لـە تۆڵەسـەندنەوەدا زیـاتر دەیشکێنێت، سکاڵا و ڕەخنەگرتن و دەربڕینی بێزاریش بەرامبەر بە ئـازار، بە هەمان جۆر ئازارەکە پتر دەکات و پەرەی پێ دەسێنێت!

◆ *مەسەلەی دووەم:*

هەر موسیبەتێکی ماددی تا بە گەورە تەماشا بکرێت، گەورەتر دەبێت. بە پێچەوانەوەشە هەتا بە بچووك سەیر بکرێت، بچووك دەبێتەوە.

بۆ نموونە: ئەو شتانەی کە لە دەمی تاریکایی شـەو بـە ئەندێشـەی مرۆڤـدا دێن، هەتا بیریان لـێ بکاتەوە و بایەخیان پێ بدات، لـە بەرچاویدا پتر گـەورە دەبن. بەڵام گەر پشتگوێیان بخات، نامێنن!

یان ئەگـەر مـرۆڤ شـارە زەردەواڵەیـەك بورووژێنێت ئەوا زیـاتر هێرشـی دەکەنە سەر، بەڵام گەر گوێیان نەداتێ، بڵاوەی لـێ دەکەن!

هەموو یەکێك لە گرفتە ماددی‌یەکانیش بە هـەمان جۆرە، چونکـە ئەگـەر مـرۆڤ گرنگی و بایـەخێکی گـەورەی پـێ بـدات، ئـەوا لـە جەسـتەوە تێپـەڕ دەبێت و دەڕواتە ناخەوە و لە دڵدا جێی خۆی دەکاتەوە، ئیـتر لـەوێوە دەبێـت بە گرفتێکـی مەعنـەوی و بـەرە بـەرە زیـاد دەکـات و پـەرە دەسێنێت تـا دەبێتـە پاڵپشتی گرفتە ماددی‌یەکە و درێژەی پێ دەدات.

بەڵام هەرکات مرۆڤ، لـە ڕێی "ڕازی بوونـی بـە قـەزای خـوا" ڕیشـەی هـەموو خەفـەت و داخێکـی لـە دڵـی خۆیـدا دەرهێنا و، پشتی بـە میـهرەبانیی

خواوەند بەست، ئەوا نەخۆشی‌یە ماددی‌یەکەشی بەرەو کزی دەڕوات تا لە ئەنجامدا تەواو دەبێت و نامێنێت، بە وێنەی ئەو درەختەی کە ڕیشەکانی دەردەهێنرێت، لق و پەل و گەڵاکانیشی وشك دەبن!

ڕۆژێکیان - بۆ دەربڕینی ئەم ڕاستی‌یە - ئەم وتانەی خوارەوەم لەبەر خۆمەوە وت:

کاکی داماوی بێچارە!

واز لە سکاڵا و هاوار بهێنە و، پشت بە خوای گەورەی خۆت ببەستە..

چونکە سکاڵا - خۆی لە خۆیدا - بەڵایەکی ئاوێتەی بەڵایە و گوناهێکە لە دووتوێی گوناهباریدا.

گەر بە بۆنەی ئەم بەڵایەتەوە "بەڵابەخش" بناسیت و بیدۆزیتەوە، ئەوا بەڵاکەت لە ڕاستیدا دەبێت بە بەخششێکی مەزن و سەفایەکی یەکجار زۆر.

بەڵام دنیاکەت - بە بێ خواناسی - سەرانسەر ئازارە و هەردەم ڕوو لە نەمانە.

کەواتە واز لە سکاڵا بهێنە و، لەم بەڵایەدا پشت بە خوا ببەستە و، قازانجی شوکرانەبژێری دەستی خۆت بخە، چونکە زەردەخەنەی گوڵ لە شەوقی ڕووی "بولبولی عاشقیەتی"!

بۆچی لە دەست بەڵایەکی بچووك هاوار دەکەیت، لە کاتێکدا کە پڕ بە دنیا کۆڵی بەڵات لەسەر شانە؟!

زەردەخەنەی "تەوەککول" لە ڕووی بەڵادا بنوێنە، با ئەویش بە پێکەنین بەرەو ڕووت بێتەوە..

چونکە هەتا ئەو لە پێکەنیندا بێت، ئەوا هێدی هێدی بچووکتر دەبێتەوە، تا بە تەواوی نامێنێت.

بەڵێ، هەروەك مرۆڤ گەر بە ڕووی گەش و خەندانەوە پێشوازی لە دوژمنەکەی بکات ئەوا کەفوکوڵی ڕق و قینی نێوانیان کەم دەبێتەوە تا دەگاتە ئەوەی دوژمنایەتیی لە نێوانیاندا نەمێنێت، تەنانەت دوژمنایەتی‌یەکەیان دەبێت بە ئاشتی و تەبایی[1]، بە هەمان جۆر گەر مرۆڤ پشت بە خوای گەورە ببەستێت و لەو ڕێیەوە پێشوازی لە بەڵا و گیروگرفتەکان بکات، ئەوا سەرجەم گیروگرفتەکانی کۆتاییان پێ دێت، تەنانەت ئاسەواریشیان نامێنێت.

◆ *مەسەلەی سێهەم:*

هەموو سەردەمێك حوکمێکی تایبەت بە خۆی هەیە. جا لەم سەردەمەی خۆماندا - کە "بێ ئاگایی" تیایدا پەرەی سەندووە - "بەڵا"ش شێوەی خۆی گۆڕیوە! واتە ئەوەی سەبارەت بە هەندێ کەس بە گرفت و "بەڵا" دادەنرێت، بۆ هەندێکی تر بە گرفت و بەڵا دانانرێت، بەڵکو جۆرێکە لە چاکە و بەزەیی خوا سەبارەت بەوان!

جا لەبەر ئەوەی من هەندێ لە بەڵادارانی ئێستا بە بەختەوەر دەزانم - بە مەرجێ ئەو بەڵایە ڕووی نەکردبێتە ئایینەکەیان - ئەوا پێم وا نی‌یە بەڵاکانیان زیانبەخش بن تا ڕقم لەو بەڵایە بیێتەوە! هەر لەبەر ئەوەشە کە بەزەییم بەو کەسانەدا نایەتەوە. چونکە سەرنجم داوە: هەرکام لەوانە کە هاتوون بۆ لام و سەردانیان کردووم، لەچاو هاوەڵانی تری خۆی زیاتر دەستی بە ئایینەکەیەوە گرتووە و پەیوەندیشی لەگەڵ دواڕۆژدا لە هی ئەوان گەلێ گەرموگوڕتر بووە!

---

(١) خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِدْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ فَإِذَا الَّذِي بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ عَدَاوَةٌ كَأَنَّهُ وَلِيٌّ حَمِيمٌ﴾ (فصلت:٣٤). (وەرگێڕ هێناویەتی)

لەمەوە تێگەشتم كە نەخۆشیی ئەو جۆرە كەسانە "بەڵا" و موسیبەت نی‌یە، بەڵكو یەكێكە لە نیعمەتە زۆر و لە ژمارە نەهاتووەكانی خوای گەورە، چونكە هەرچەند ئەم نەخۆشی‌یە لەم دنیا كەم خایەن و فانی‌یەدا ئازارێكی كەمی خاوەنەكەی دەدات، بەڵام سوودێكی زۆری بۆ ژیانی هەمیشەیی دوارۆژی ئەو كەسە تێدایە و، بۆی دەبێت بە جۆرە پەرستشێكی بێگەرد و خاوێن!

بەڵێ، ئەم لاوەی كە ئێستا لە نەخۆشی‌یەكەیدا دەستی بە فەرمانەكانی خواوە گرتووە و بەجێ‌یان دەهێنێت، لەوە نەدەچوو - گەر تەندروستیی تەواو بوایە - ئەو فەرمانانەی جێبەجێ بكردایە! بەڵكو لەوانەیە، بەهۆی لاوی و هەڵوێستە ناڕەواكانی ڕۆژگارەوە، بەرەو خراپكاری هەنگاوی بنایە.

* * *

## كۆتایی

خوای باڵادەست بۆ مەبەستی دەرخستن و پیشاندانی دەستەڵاتی ڕەها و بەزەیی هەرە فراوانی خۆی: "بێ دەستەڵاتی" و "هەژاری"یەكی لە ئەندازەبەدەری لە سروشتی مرۆڤدا داناوە. مرۆڤیشی بە جۆرێ بەدی هێناوە كە لە چەندین لاوە "ئازار" و "خۆشی" بچێژێت، تاكو نەخش و نیگارە ڕەنگین و زۆرەكانی ناوە جوانەكانی خۆی لەودا دەربخات.

دەبینین خوای گەورە مرۆڤی لە شێوەی مەكینەیەكدا بەدی هێناوە كە سەدان ئامێری تێدایە و هەریەك لەو ئامێرانەش "ئازار" و "خۆشی" و "پاداشت" و "تۆڵە"ی تایبەتیی خۆیان هەیە. وەك بڵێی: ئەو ناوە جوانانەی

خوای گەورە کە لە جیهاندا دەدرەوشێنەوە - ئەو جیهانەی کە مرۆڤێکی گەورەیە - بە هەمان جۆر لە مرۆڤیشدا - کە جیهانێکی بچووکە - بدرەوشێنەوە.. جا هەروەك لایەنە سوودبەخشەکانی مرۆڤ (وەك: تەندروستی و خۆشحاڵی و شتانی تر) بە وێنەی مەکینەیەکی شوکرانەبژێریان لێ دێت، بە هەمان جۆر ئامێرەکانی تری ئەم مەکینەیەش بە موسیبەت و نەخۆشی و ئازار دەکەونە گەڕ و، ئەو "هەژاری" و "بێ دەستەڵاتی"یەی مرۆڤ دەردەخەن، ئیتر نەك تەنها بە زمانێك، بەڵکو بە زمانی هەموو ئامێرێك لە ئەندامەکانی، پەنا دەباتە بەر خوا و لێی دەپاڕێتەوە..

واتە مرۆڤ بەم جۆرە شتانەی کە کاری تێدەکەن و ڕێی لێ دەگرن، وەکو پێنووسێکی گەورە وایە کە هەزاران پێنووسی تری لێ بوویێتەوە و بەسەرهاتەکانی ژیانی پێ بنووسێت، چ لەسەر لاپەڕەکانی ژیانیدا و، چ لەسەر لاپەڕەکانی "لەوحی میسالی"دا، هەروەها تابلۆیەکی ڕازاوەی لە ناوە جوانەکانی خوا پێ دروست دەکات و، وەك چامەیەکی هۆنراوەی بەسۆز و تابلۆیەکی ئاگادارکردنەوە(لوحة إعلان)ی لێ دێت کە بە باڵای نیعمەتەکانی خوادا دەخوێنن.

ئیتر بەم جۆرە ئەرکی فەرمانبەرێتیی ناو سروشتی خۆی بەجێ دەهێنێت.

* * *

پاشکۆی دووهەمی پەیامی بیماران
مەکتووبی حەڤدەهەم لە کتێبی مەکتووبات

# پرسەی منداڵێک

باسمه سبحانه

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

بۆ برای ئازیزی ئاخیرەتم، بەڕێز: "حافظ خالید"!

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿وَبَشِّرِ الصَّابِرِينَ ۞ الَّذينَ إذا أصابَتْهُمْ مُصيبَةٌ قالُوا إنّا لله وَإنّا إلَيْهِ راجِعُونَ﴾(البقرة:١٥٥–١٥٦)

برام!

هەواڵی مردنی منداڵەکەتان گەلێ ئازاری دام. بەڵام هەموو فەرمانێك بە دەستی خوای گەورەیە. ڕازی بوون بە قەزا و تەسلیم بوون بە قەدەری ئەو، درووشمی موسڵمانێتی‌یە.

لە خوا دەپاڕێمەوە ئارامی‌یەکی ڕەنگینتان پێ ببەخشێت و منداڵەکەتان بۆ بکات بە پشتگیر و تکاکار لە ڕۆژی دوایدا.

وا لێرەدا بۆ ئێوە و بۆ هەموو موسڵمانێکی خاوەن تەقوا و لە خوا ترس، پێنج خاڵی وا باس دەکەین کە مزگێنی‌یەکی خۆش و دڵدانەوەیەکی ڕاستەقینەیان تێدا بێت:

● خاڵی یەکەم:

واتا و نهێنیی ئایەتی پیرۆزی: ﴿وِلْدانٌ مُخَلَّدُون﴾ بەم جۆرەیە:

منداڵی ئیمانداران کە پێش باڵغ بوونیان کۆچی دواییان کردووە، لە بەهەشتدا بە خۆشەویستی دەمێننەوە و هەتاهەتایی دەبن بە شێوەیەك کە شیاوی بەهەشت بێت و، دەبن بەهۆی دڵخۆشی بۆ دایکان و باوکانیان کە ڕۆشتوونەتە بەهەشت و، ناسکترین چێژی هەمیشەیی بۆ ئەو دایك و باوکانە دابین دەکەن کە بریتی‌یە لە خۆشەویستی و دواندنی منداڵ.

جا لەبەر ئەوەی هەموو شتێکی خۆش و بەلەزەت لە بەهەشتدا هەیە، ئەوا ئەو وتەیە ڕاست نی‌یە کە دەڵێ: (لەبەر نەبوونی زاوزێ لە بەهەشتدا، خۆش ویستنی منداڵیشی تێدا نی‌یە و، گەمە و گاڵتەش لەگەڵیاندا لەوێ دەست ناکەوێت)..

نەخێر.. ئەم وتەیە ڕاست نی‌یە. چونکە خۆشەویستیی منداڵان - کە دەسکەوتێکی گەورەیە - و گەمە و گاڵتە کردن لەگەڵیاندا، بە ملیۆنەها ساڵ لە بەهەشتدا، بەوپەڕی ڕێکوپێکی و دوور لە هەموو تاریکی و لێڵی‌یەك بەردەوام دەبێت، لە بریی ئەو دە ساڵە کورت و پڕ ئەشکەنجە و ئازارەی کە لە دنیادا لەگەڵیان دەبرێتە سەر.

ئەم ئایەتە پیرۆزە بە ڕستەی: ﴿وِلْدانٌ مُخَلَّدُون﴾ هەموو ئەم واتایانەمان پێ ڕادەگەیەنێت و، ئەمەش دەبێتە مزگێنی‌یەکی گرنگ بۆ باوەڕداران و بەختیاری‌یەکە بۆ دواڕۆژیان.

● **خاڵی دووهەم:**

سەردەمێك پیاوێك لە بەندیخانەدا بوو. ماوەیەکی زۆری نەخایاند کوڕە خۆشەویستەکەشیان خستە لای! ئیتر جگە لە ئازاری تایبەتیی خۆی، ئازاری کوڕەکەشی و نەتوانینی دابین کردنی حەوانەوەی، ئەوەندەی تر ئازارەکەی ئەوی زیاد کردبوو.. فەرمانڕەواکەش لەبەر ئەوەی زۆر میهرەبان بوو، مرۆڤێکی نارد بۆ لای ئەم پیاوە کە پێی بڵێت:

(هەرچەند ئەم منداڵە کوڕی تۆیە، بەڵام لە هەمان کاتدا یەکێکە لە دانیشتووانی وڵاتەکەم و گەلەکەم. وا ئێستا دەیبەم بۆ لای خۆم و لە کۆشکێکی گەورەی ڕەنگین و ڕازاوەدا پەروەردەی دەکەم).

باوکە بەندکراوەکەش کە ئەمەی بیست، دەستی دایە گریان و ئاخ و ئۆف کردن و خەفەت خواردن.. پاشان وتی:

(نەخێر، ناتاندەمێ.. چونکە ئەم کوڕە هۆی دڵنەواییمە لەم بەندیخانەیەدا)!

هاوەڵەکانی بەندیخانەشی پێیان وت:

(برادەر! هیچ پێویست بە خەم خواردن ناکات و خەفەتیش دادی تۆ نادات. ئەگەر تۆ خەمی کوڕەکەتە، ئەوا ئەو بۆ کۆشکێکی بەرینی ڕازاوە دەڕوات، لە بریی مانەوەی لەم بەندیخانە تەنگ و نالەبار و ڕزیوەدا..

خۆ ئەگەر خەمی خۆشتە و بە دوای بەرژەوەندیی تایبەتیی خۆتدا دەگەڕێیت، ئەوا باش بزانە کە ئەگەر کوڕەکەت لێرەدا بۆ مەبەستی دڵدانەوە و خەمڕەوێنیی تۆ بمێنێتەوە - کە ئەمەش سوودێکی کاتییە و لەوانەشە هەرگیز نەیەتەدی - تووشی ئازار و ئەشکەنجەیەکی زۆر دەبێت.

بەڵام ئەگەر بڕواتە ئەو کۆشکەی پادشا، دەبێت بە هۆی دەستکەوتنی هەزاران سوود بۆ تۆ، چونکە مانەوەی ئەو لەوێ، دەبێتە تکاکارت و هۆی

جووڵاندنی بەزەیی فەرمانڕەوا سەبارەت بە تۆ، ئیتر ڕۆژێك دێتە پێش کە فەرمانڕەوا حەز بکات لەگەڵ کوڕەکەتدا بە یەکتر شاد ببنەوە. خۆ گومانیشی تێدا نییە کوڕەکەت نانێرێتەوە بەندیخانە بۆ لای تۆ، بەڵکو تۆ دەردەکات و دەتباتە ناو ئەو کۆشکەو، لەوێ بە دیتنی شاد و بەختەوەر دەبیت.. ئەمە لە کاتێکدا کە ئەگەر تۆ گوێڕایەڵی پادشا بیت و باوەڕت پێی هەبێت).

ئێستاش برای ئازیزم!

دەبێ باوەڕدارانی هاوێنەی تۆ لە ڕۆشنایی ئەم نموونەیەوە بیر بکەنەوە کاتێ منداڵێکیان کۆچی دوایی دەکات. واتە دەبێ بەم جۆرە بیر بکەنەوە:

(ئەم منداڵە بێ گوناهـ و پاکە.. بەدیهێنەریشی تابلێی خاوەنی بەزەیی و میهرەبانە.. سۆز و چاودێریی ئەو خواوەندە گەورە و میهرەبانەش بردیەوە بۆ لای خۆی لە بریی ئەو دڵسۆزییە کورت و پەروەردە کەمو کووڕەی من و، لە بەندیخانەی ئێش و ئازار و بەڵای دنیا دەربازی کرد و ناردی بۆ بەهەشتە گەورە و ڕازاوەکەی خۆی.. خۆزگەم بە خۆی! چەندە بەختیارە! یاخوا پیرۆز و نۆشی گیانی بێت! کێ دەزانێت گەر لێرە بمایەتەوە چیی دەکرد؟ هەڵسوکەوتی لەم دنیایەدا چۆن دەبوو؟ هەر لەبەر ئەوەشە کە خەفەتی بۆ ناخۆم و بە بەختەوەری دەزانم.

ماوەتەوە بیرێك لە سوودی تایبەتیی خۆم بکەمەوە..

بەڵێ، ئەگەر بمایە، ئەوپەڕی ئەو سوودەی کە لێیەوە دەستم دەکەوت هێندە دەبوو کە دەیتوانی بۆ ماوەی دەساڵێك خۆشەویستییەکی ئاوێتەی ئازاری دنیام بۆ دابین بکات. دوای ئەوەش ئەگەر کوڕێکی باش و دڵسۆز و لە کاروباری دنیادا لێهاتوو بوایە، لەوانەیە هەندێ یارمەتی و هاوکاریی لەگەڵمدا بکردایە.

بەڵام بە مردنەكەی خۆشەویستی‌یەكی بێگەردی دەیان ملیۆن ساڵی بەهەشتی هەمیشەیی بۆ دەستەبەر كردم و، بوو بە تكاكارم لە لای خواوەندی میهرەبان، تاكو منیش بڕۆمە بەهەشتی هەمیشەیی خانەی بەختیاری. كەواتە ئەگەر بەرژەوەندیی خۆیشم لێك بدەمەوە، دەبێ هیچ خەفەتێك نەخۆم، چونكە هەر شتێك كە خوا ویستی لەسەر بوونی هەبێت، هەر دەبێ ببێت. لە لایەكی تریشەوە ئەگەر كەسێك سوودێكی گومان لێكراوی خێرای لە دەست دەرچووبێت، بەڵام لە هەمان كاتدا هەزار سوودی بێ گومانی داهاتووی ماوەیەك درەنگی بۆ بەجێ مابێت، هەرگیز خەفەت و ئازار دەرنابڕێت و نائومێدی سەری تێ ناكات).

● خاڵی سێهەم:

ئەم منداڵەی كە كۆچی دوایی كردووە، بەندە و بەدیهاتووی خوایەكی میهرەبان و خاوەن بەزەیی بوو، هەروەك هاوڕێ و برادەرێك بوو خوای گەورە لە لای دایك و باوكی دانابوو، تاكو لە ژێر چاودێریی ئەواندا بمێنێتەوە. هەروەها خواوەند ئەو دایك و باوكەی كردبوو بە دوو خزمەتكاری دڵسۆزی ئەو منداڵە. پاداشتی پێشەكی و زووی ئەو خزمەتەشی پێ بەخشیبوون كە ئەو بەزەیی و شەفەقەتە بەتام و چێژەی باوك و دایكە بەرامبەر منداڵەكانیان. وا ئێستاش هەر ئەو بەدیهێنەرە خاوەن سۆز و بەزەییە كە - لە هەزاردا نۆسەد و نەوەد و نۆ بەشی ئەو منداڵە هی ئەوە - گەر میهرەبانی و دانستەكەی خواستیان وا بوو منداڵەكە ببەنەوە و كار و ئەركەكانی ئەستۆی كۆتایی پێ بهێنن، ئایا دەبێ مرۆڤی موسڵمان و ئەهلی ئیمان بگرین و نائومێدی دەرببڕن؟ یان ئایا دەگونجێ دەست بكەن بە شین و هاوار و گریان، كە ئەمەش - لە ڕاستیدا - دەبێتە سكاڵا كردن لە خاوەنی هەزار بەشەكە لە بەرامبەر بەشێكی ساكاری بچووكەوە؟

ئەم چەشنە ڕەفتارە تەنها لە بێ ئاگا و گومڕایانەوە دەوەشێتەوە، نەك ئیمانداران!

● **خاڵی چوارەم:**

ئەگەر دنیا هەتاهەتایی بوایە..

ئەگەر مرۆڤ تیایدا هەمیشەیی بوایە..

یان:

ئەگەر "جودایی" ئەبەدی بوایە..

ئەو کاتە نائومێدی و خەفەت و ئازار واتایەکی تێدا دەبوو..

بەڵام مادەم دنیا میوانخانەیەکی سەرەڕێیە، ئەوا ئەو منداڵە کۆچ کردووە بۆ هەر لایەك بڕوات، ئێمەش و ئێوەش - هەمووومان - بێ گومان دەڕۆین بۆ ئەوێ. ئەم مردنەش تەنها بۆ ئەو نییە، بەڵکو ڕاستە شەقامێکە بۆ هەموان. هەر کەسێك لەم سەرزەوییەدایە دەبێ ڕۆژێك پیایدا بڕوات.

جا لەبەر ئەوەی جودایی هەمیشەیی نییە، ئەوا لە ڕۆژانی داهاتوو، چ لە بەرزەخ و چ لە بەهەشتدا، بە یەکتر شاد دەبنەوە. هەر لەبەر ئەوەشە کە پێویستە مرۆڤ لە هەڵوێستێکی وادا بڵێت:

(ئەمە فەرمانی خوایە و.. هەر ئەو بەخشیویەتی و هەر ئەویش بردوویەتیەوە).

هاودەم لەگەڵ ئەمەشدا، دەبێ کاڵای ئارامگرتن و شوکرانەبژێری بپۆشین و، بڵێین:

"الحمد لله على كل حال".

● **خاڵی پێنجەم:**

میهرەبانی(شەفەقەت) ناسکترین و جوانترین و شیرینترین و پاکترینی درەوشانەوەکانی میهرەبانیی خواوەندە و، ئیکسیرێکی نوورانییە و، لە

عیشق گەلێ کاریگەرترە و، کورتترین و زووترین ڕێگا و هۆی گەیشتنیشە بە خوای گەورە.

بەڵێ، هەروەك عیشقی مەجازی و عیشقی دنیایی - دوای بڕینی چەند قۆناغێکی سەخت - مرۆڤ دەگەیەنێتە "عیشقی حەقیقی" و لەوێوە خاوەنەکەی بە خوای بالآدەست دەگات، میهرەبانی و شەفەقەتیش بە هەمان جۆرە؛ دڵی مرۆڤ بە خوای خۆیەوە پەیوەست دەکات، تاکو لە کورتترین ڕێگا و بە جوانترین شێوە و بە بێ هیچ سەختی و گیروگرفتێکیش، بە خوای خۆی شەرەفمەند بێت.

بێ گومان دایك و باوك - یان هەرکامێکیان - منداڵەکەیان خۆش دەوێت و پارچەیەکە لە جگەریان. جا هەرکاتێك منداڵ لە باوکی دەسێنرێتەوە، گەر ئەو باوکە بەختەوەر و ئیماندار بێت، ڕوو لە دنیا وەردەچەرخێنێت و بەخشندەی ڕاستەقینە دەبینێتەوە و، دەڵێت:

(مادەم دنیا دەبڕێتەوە، ئەوا شایانی دڵ پێوە بەستن نی‌یە. خۆ ئەو منداڵە بۆ هەر لایەك بڕوات، مرۆڤ هەست دەکات کە جۆرە پەیوەندی‌یەکی تایبەتیی لەگەڵدا هەیە).

بەم جۆرە سوودێکی مەعنەویی بەرز و گرنگی دەست دەکەوێت.

ئەم مزگێنی و مژدانەش تەنها بۆ ئیماندارانن. چونکە بێ ئاگا و گومڕایان لە مزگێنی و بەختەوەریی ئەم پێنج "ڕاستی"یە بێ بەشن.

دەتوانن ئەو بارە دەروونی‌یە ئازاربەخش و بەسۆیەی ئەوانتان بۆ دەربکەوێت کاتێ کە هەریەك لەوان بەم جۆرە بیر دەکاتەوە و دەبینێت:

تاقانەیەکی هەیە و زۆریشی خۆش دەوێت، کەچی ئێستا لە سەرەمەرگدا دەیبینێتەوە و، بیر لە سبەینێی ئەو منداڵەی دەکاتەوە لە بریی جێگا و پێخەفی نەرم و نۆڵی ماڵەوەی لەناو خاکدا ڕاکشاوە. هێندەش بە هەڵەدا چووە کە

- بـه ئەندێشـەی خـۆی - پێـی وایـه مـردن "نـەبوون" و "جودایـی"یـەکی هەمیشەییە و، لە لایەکی تریشەوە وا تێدەگـات کـە مرۆڤ بە هەتاهـەتایی لـە دنیـادا دەمێنێتـەوە. ئنجـا بـە هیـچ جۆرێکیـش سـۆز و بـەزەیی خـواوەنـدی میهرەبان و، نیعمەت و بەهەشتە ڕازاوەکەی ئەوی بە دڵدا نایەت!

تۆش دەتوانیـت ئەمە بکـەیت بە تەرازوویـەك و، ئەو خەفـەت و ئـازار و نائومێدییـەی ئـەوانی پـێ هەڵبسـەنگێنیت کـە تەنانـەت تروسـکاییەکیش ڕووناکیی تێدا بەدی ناکەیت، با بۆ خۆت بزانیت تـا چ ڕادەیـەك تـاریك و پڕ لە نائومێدییە.

کەچی لە هەمان کاتدا ئیمان و ئیسـلام - کـە هـۆی بەختـەوەریی هـەردوو دنیان - بە مرۆڤی باوەڕدار دەڵێن:

ئەم منداڵەی کە ئێستا لە ئازاری سەرەمەرگدایە، دوای دەرباز کردنی لـەم دنیا کەم نرخ و فانییە، بەدیهێنەری میهرەبانی دەینـێرێت بۆ بەهەشتی بـەرینی خۆی و، دەیکـات بە تکاکـارت لـە ڕۆژی دواییـدا. پاش ئـەوەش دەبێـت بـە منداڵێکی خۆشەویستی هەمیشەییت.

کەواتـە، مەشـڵەژێ و هـەرگیز خەفـەت مـەخۆ، چونکـە ئـەم جودایـی و لێکدابڕانەی نێوانتان بۆ ماوەیەکی کاتی و کەم خایەنە. دەسا بۆ خـۆت ئـارام بگرە و، بڵێ:

"الحكم لله".

﴿إِنَّا للهِ وَإِنَّا إليهِ راجِعُون﴾.

الباقي هو الباقي

**سەعیدی نوورسی**

پاشکۆی سێههمی پهیامی بیماران
لە کتێبی (پاشبەندەکان)
بەشی پاشبەندی (بارلا)

# نامەیەک بۆ پزیشکێک

بسم الله الرحمن الرحيم

**(ئەمەی خوارەوە دەقی نامەیەکە بۆ پزیشکێك کە گەلێ تاسەمەندی پەیامەکانی نوور بووە، دوای ئەوەی کە لە ئەنجامی خوێندنەوەی زۆری ئەو پەیامانەوە بێداربوونەوەیەکی ڕۆحیی تێدا دروست بووە).**

سڵاو ئەی هاوڕێی دڵسۆز و ئەی پزیشکی بەختەوەری ئازیز کە پەیی بە دەستنیشان کردنی نەخۆشیی خۆی بردووە!

ئەو بێداربوونەوە ڕۆحییەی کە نامەکەتان دەری دەخات، شایانی پیرۆزبایی لێکردنە.

برام! بزانە کە: "ژیان" بەنرخترین شتی ناو جیهانی بوونەوەرانە. هەرشتێکیش خزمەتی "ژیان" بکات بەرزترین ئەرکی سەرشانە و هەوڵدانیش بۆ بەکارهێنانی ژیانی لەناوچووی فانی لە پێناوی ژیانێکی هەمیشەییدا بەنرخترین فەرمانبەرداریی ژیانە.

بیشزانە كە پوختە و گرنگیی تەواوی "ژیان" لەوەدایە كە "تۆو" و بنەما و سەرەتای گەشە كردنی ژیانێكی نەمری هەمیشەیی بێت. بە ڕادەیەك كە بۆچوونی پێچەوانەی ئەمە، واتە تەرخان كردنی هەموو خەم و بیر و زانینێك بۆ ئەم ژیانە لەناوچووەی دنیا، تێكدانێكی تەواوەتیی ژیانی هەمیشەیی‌یە و، شێتی و نەفامی‌یەكی وەك ئەوە وایە كە یەكێك "خۆر"ێكی هەمیشەیی بە بریسكانەوەیەكی كتوپڕی بگۆڕێتەوە.

پزیشكانی بێ ئاگا لە دواڕۆژ و نوقم بووانی ناو لیتاوی ماددیگەری، لە ڕوانگەی ڕاستی‌یەوە، لە هەرچی كەسە نەخۆشترن! بەڵام ئەگەر ئەوانە بتوانن چارەسەریی ئیمانی و دەرمانە دژ بە ژەهرەكان لە دەرمانخانەی قورئانی پیرۆز وەربگرن و بە چەند ژەمێك بەكاری بهێنن، ئەوا جگە لەوەی كە زامە مرۆڤانە و نەخۆشی‌یە تایبەتی‌یەكانی خۆیانی پێ چارەسەر دەكەن، دەشبن بە هۆی ساڕێژ كردنی تێكڕای زامەكانی مرۆڤایەتی بەگشتی.

لە خوای گەورە دەپاڕێمەوە ئەم بێداربوونەوە ڕۆحی‌یەتان بكات بە مەڵهەمێكی شیفابەخشی زامەكانی خۆت و، نموونەیەكی زیندوو و خاوێن و ڕچەشكێن لە بەردەم پزیشكانی تردا و بیكات بە دەرمانی دەردی ئەوانیش.

لاتان ئاشكرایە كە دڵدانەوە و دڵنەوایی نەخۆشێكی نائومێد لە هەموو ترووسكایی‌یەكی هیوای ژیان چەندە كارێكی گرنگە، كاتی وا دەبێ ئەم دڵدانەوەیە بۆ ئەو جۆرە نەخۆشانە لە هەزار دەرمان و چارەسەر سوود بەخش تر دەبێت. بەڵام پزیشكی نوقم بووی ناو سروشتی دڵ ڕەق و لیتاوی ماددیگەری، نائومێدی‌یە دڵتەزێنەكەی ئەو هەژارانە پتر دەكەن، بە ڕادەیەك كە ژیان لە بەرچاوی ئەواندا بە تاریكستانێكی ڕەش پیشان دەدەن.

پشت بە خوا ئەم ڕاپەڕین و بێداربوونەوە ڕۆحی‌یەی تۆ دەبێ بە مایەی دڵنەوایی و دڵدانەوەی ئەو هەژارانە و كەسانی تری هاوچەشنیان و، دەتكات

به‌ پزیشكێكی ڕاسته‌قینه‌ی ئه‌وتۆ كه‌ ڕووناكی ئاراسته‌ی دڵان بكه‌یت و شادمانیش به‌ ده‌روونی خه‌ڵكی ببه‌خشیت!

وه‌ك ئاشكرایه‌ ته‌مه‌ن یه‌كجار كورته‌ و ئه‌ركه‌ پێویسته‌كانی سه‌رشانیش گه‌لێ زۆرن. كه‌واته‌ ئه‌ركه‌كانمان له‌ چاو كاته‌كانماندا گه‌لێ زۆر و زیاترن. جا ئه‌گه‌ر تۆش - وه‌ك من - زانیاری‌یه‌كانی ناو مێشكت بپشكنیت و لێیان ورد ببیته‌وه‌، ده‌بینیت هه‌ندێ له‌و زانیاری‌یانه‌ بێ كه‌ڵك و بێ سوودن و وه‌كو خۆڵه‌مێش وان. من به‌ش به‌ حاڵی خۆم ئه‌م چه‌شنه‌ پشكنین و لێكدانه‌وه‌ و ته‌ته‌ڵه‌ كردنه‌م ئه‌نجام داوه‌و، گه‌لێ زانیاریی بێ سوود و بێ بایه‌خم بۆ ده‌ركه‌وتووه‌.

به‌ڵێ، پێویست ده‌كات مرۆڤ به‌ دوای چاره‌سه‌ر و هۆكارێكدا بگه‌ڕێت تاكو بتوانێت ئه‌و زانیاری‌یه‌ زانستی و فه‌لسه‌فی‌یانه‌ بكات به‌ چه‌ند زانیاری‌یه‌كی سوودبه‌خش و، ڕووناك و، ڕووناكیده‌ر و، زیندوو و، ته‌ڕ و، پاراو و، به‌رهه‌م به‌خش.

برام! تۆش وه‌كو من بلاڵێره‌وه‌ و له‌ خوای دانای شكۆمه‌ند بپاڕێره‌وه‌ كه‌ بیركردنه‌وه‌كانت بۆ خۆی و له‌ پێناوی خۆیدا پاڵفته‌ و خاوێن بكات و، ئاگر به‌ربداته‌ ئه‌و لیژنه‌ داره‌، تاكو ئه‌و زانینه‌ زانستی‌یه‌ بێ سوودانه‌ به‌م ئاگره‌ ڕووناك ببنه‌وه‌ و بگۆڕرێن به‌ چه‌ند زانستێكی به‌نرخی خواناسی.

هاوڕێی زیره‌كم!

له‌ دڵه‌وه‌ گه‌لێ ئاره‌زوومه‌ندم كه‌سانی هاووێنه‌ی "خلووصی" له‌ زانایانی تاسه‌مه‌ند و تامه‌زرۆی نووره‌كانی ئیمان و نهێنی‌یه‌كانی قورئان، ده‌ربپه‌ڕنه‌ مه‌یدان.

جا له‌به‌ر ئه‌وه‌ی كتێبی "وته‌كان" ده‌توانێت له‌گه‌ڵ ویژدان و دڵ و ده‌روونتدا بدوێت، ئه‌وا نه‌ك هه‌ر ته‌نها به‌ نامه‌یه‌كی تایبه‌تی له‌ منه‌وه‌ بۆ تۆ،

بەڵكو هەموو وتەیەك لە وتەكانی ئەو كتێبە بە نامەیەكی ئاراستەكراو دابنێ لە كەسێكی بانگەوازكاری قورئان و ڕێ پیشاندەری خەڵكی‌یەوە بۆ لای ئەو قورئانە پیرۆزە. هەروەها بە ڕەچەتەیەكی دەرمانخانەكەی قورئانی حەكیمی وەربگرە. ئەو كاتە بەم كارەت و دووراودوور كۆڕێكی فراوانی خاوێن و دانیشتنێكی پیرۆزی ڕووبەڕوو ساز دەكەیت!

تۆ لە نامەنووسیندا بۆ من هەركات بتەوێت سەربەستیت، بەڵام تكام وایە لە وەڵام نەدانەوەی دڵگران نەبیت! چونكە من لە مێژە لەسەر نەنووسینی نامە - مەگەر بە دەگمەن - ڕاهاتووم، تەنانەت وا سێ ساڵە لە یەك وەڵام زیاترم بۆ براكەم نەنووسیوە، هەرچەندەش ئەو نامەی زۆرم بۆ دەنێرێت.

**سەعیدی نوورسی**

## پوختەیەک لە ژیانی دانەر

* ناوی "بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی"یە.
* لە نێوان چیا بڵندەکان و لە گوندی "نوورس"ی سەر بە پارێزگای "بەدلیس"ی کوردستانی ژێر دەستەڵاتی عوسمانی لە بنەماڵەیەکی کوردی دیندار لەدایك بووە.
* لە نێوان ساڵەکانی (١٨٧٦-١٩٦٠ز)دا ژیاوە.
* "صۆفی میرزا"ی باوکی بە خواپەرستی و پیاوچاکی بەناوبانگ بووە و، هەر خۆراکێك حەڵاڵ نەبوبێت دەرخواردی منالەکانی نەداوە.. خاتوو "نووریە"ی دایکیشی بە پاك و خاوێنی و دەستنوێژەوە نەبووبێت شیری بە منالەکانی نەداوە!
* دایکی لە کاتی جەنگی جیهانیی یەکەم و، باوکیشی لە ساڵەکانی بیستی سەدەی پێشوودا کۆچی دواییان کردووە و، لە گۆڕستانی گوندی نوورس نێژراون.
* چوارەم منالی خانەوادەکەیانە کە یەك لە دوای یەك ئەمانەن: (دورڕییە، خانم، عەبدوڵلا، سەعید، محەممەد، عەبدولمەجید، مەرجان).
* لە تەمەنی چواردە ساڵیدا بڕوانامەی زانایی لە زانستە ئیسلامییەکاندا بەدەست هێناوە.
* بە هەوڵ و تەقالای خۆی شارەزایی لە زانستەکانی ڕۆژگاردا، وەك: کیمیا فیزیا، بایۆلۆجی، جیۆلۆجی، بیرکاری، گەردوونناسی، جوگرافیا، هتد.. پەیدا کردووە.

* لەبەر زیرەکیی ناوازە و لە ڕادەبەدەری، نازناوی (سەعیدی مەشهوور) پاشان (بەدیعوززەمان)ی لە لایەن زانایانەوە پێ دراوە.
* یەکەم کەسە هەوڵی داوە بۆ دامەزراندنی زانکۆ لە کوردستاندا و، کردنەوەی قوتابخانەی کوردی و، خوێندنی وانەی زانستەکانی سەردەم شان بە شانی زانستە ئاینییەکان.
* گەورەترین کەسایەتیی کوردی ئەم سەردەمە و مەزنترین زانایە کە لە دوای مەولانا خالیدی نەقشبەندی لەناو نەتەوەی کورددا هاتووەتە دنیاوە و، ناوبانگی جیهانیی بۆ دروست بووە و، لە ڕووبەرێکی فراوانی سەر زەویدا سوود لە بەرهەمەکانی وەردەگیرێت.
* تاکە کەسایەتی بووە کە هەموو زەبر و زەنگێکی مستەفا کەمال و دامودەزگا چەوسێنەرەکانی و سی و پێنج ساڵی بەندی و زیندانی تاکە کەسی و ڕەهەندەیی و دەست بەسەری و دەیان دادگای تۆقێنەر نەیانتوانیوە چۆکی پێ دابدەن و لە خەباتی ڕەوای خۆی کۆڵی پێ بدەن. تەنانەت ئەو توانیویەتی سەرکەوتنیشیان بە سەردا بە دەست بهێنێت.
* زیاتر لە سەد و سی کتێب و نامیلکەی لە ژێر ناونیشانی (سەرجەمی پەیامەکانی نوور)دا نووسیوە و بڵاوی کردوونەتەوە.
* وەرگێڕانی سەرجەمی پەیامەکانی نوور بۆ (زمانی عەرەبی) لە لایەن مامۆستا (ئیحسان قاسم صالحی)یەوە تەواو بووە و، لە دە دانە بەرگی قەشەنگدا و لە هەردوو شاری ئەستەمبووڵ و قاهیرە چەند چاپێکی یەك لە دوای یەکیان تا ئێستا لێ بڵاوکراوەتەوە.
* بەشێکی زۆریشیان لە لایەن خوشکی نۆموسڵمان: ماری وێڵد (شوکران واحیدە)ەوە کراون بە (زمانی ئینگلیزی) و، تا ئێستا پێنج بەرگی گەورەیان بە چاپی جوان و مۆدێرن بەو زمانە لێ بڵاو کراوەتەوە.

★بە (زمانی کوردی)ش تا ئێستا پێنج بەرگی گەورەی بە شێوەیەکی نایاب لێ چاپکراوە، جگە لە سێ کتێب و نامیلکەی سەربەخۆ.

★ ئەم پەیامانە بۆ چل و حەوت زمانی نەتەوەکانی جیهان وەرگێڕراون، کە تا ئێستا کاری وەرگێڕان تیایاندا بەردەوامە، وەك زمانەکانی:

ئەڵمانی، فەرەنسی، ڕووسی، ئۆردی، فارسی، ئیتالی، کۆجاراتی، مەلایا، ڕۆمانی، چینی، بولگاری، پورتوگالی، ئەلبانی، بۆسنی، ئیسپانی، مەقەدۆنی.. هەروەها گەلێ زمانی تریش.

★ تا ئێستا زیاتر لە پازدە کۆنگرەی جیهانی و دەیان کۆڕی زانستی و پێشبڕکێی ڕۆشنبیریی لە ئاستی جیهاندا لەسەر کراوە و، دەیان کتێب و، سەدان لێکۆڵینەوەی لەسەر نووسراوە و، چەندین بەڵگەنامەی زانکۆییشی لە خوێندنی باڵادا لەسەر وەرگیراوە، کە هەندێکیان لە کوردستاندا بووە.

★ دواهەمین کۆنگرەی جیهانی لەسەر مامۆستا بەدیعوززەمان لە شاری ئەستەمبووڵ لە بەرواری (٣-٥/١٠/٢٠١٠ز)دا ساز کرا و، چەندین کەسایەتیی زانستی لە (چل و چوار) وڵاتەوە بەشدارییان تێدا کرد کە توێژەرانی (سی وسێ) وڵات لەوانە سەد و پێنج دانە توێژینەوەی زانستییان پێشکەش کرد.

★ لە کوردستانی باشووریشدا، هەتا ئێستا سێ سیمینار تایبەت کراوە بە مامۆستا نوورسی و پەیامەکانی، لە شارەکانی (هەولێر، سلێمانی، سۆران). هەروەك تا ئێستا سێ مزگەوت بە ناویەوە ناونراوە لە شارەکانی (سلێمانی، سۆران، کەرکووك).

* * *

# پێڕستی بابەتەکان

| بابەت | لاپەڕە |
|---|---|

## پاشکۆی یەکەم
## (لەگەڵ پێشەوای ئارامگراندا)

## پاشکۆی دووهەم
## (پرسەی منداڵێك)



## پاشکۆی سێهەم
## (نامەیەك بۆ پزیشکێك)



* * *

# رسالة المرضى

من كليات رسائل النور التي ألفها:

**الأستاذ بديع الزمان سعيد النورسي**

ترجمها من التركية إلى العربية: **الأستاذ إحسان قاسم الصالحي**

نقلها من العربية إلى الكردية: **فاروق رسول يحيـــى**

الطبعة الرابعة (المنقحة) - بيروت

١٤٣٣هـ/٢٠١٢م

* * *

# THE PATIENT'S LETTER

From the Risale-i Nur Collection

By:

Bediuzzaman Said Nursi

Translated from the Arabic into Kurdish by:

Farooq Rasool Yahya

2012




(پەیامی بیماران) پەردەی ئازار و زام لەسەر بیماران هەڵدەداتەوە، سەرجەم دانست و نیعمەتەکانی خوای گەورەش دەخاتە ڕوو کە لە ژێر ئەو پەردەیەدان.

خوێنەر خۆی لە بەردەم (پێشەوای ئارامگراندا) دەبینێتەوە، تاکو لە نزا پاك و بێگەردەکانی هەڵبگۆزێ کە لە دڵ و دەروونی پێغەمبەرێکی گەورەوە - درووودی لەسەر بێت - هەڵدەقوڵێن و، دەفەرموێ:

﴿أَنِّي مَسَّنِيَ الضُّرُّ وَأَنتَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ﴾ !

ئەو کەسانەش کە دڵیان بە کۆچی جگەرگۆشەکانیان لە پەژارە پڕ بووە (پرسەی منداڵێك) ڕووناکیی هیوا و ئومێد لە هەموو گۆشەیەکی دڵ و دەروونیاندا بڵاو دەکاتەوە.

مامۆستا نوورسی دەڵێت :

(لله دَرُّ الْعِلَّةِ والْمُصيبَةِ والذِّلَّة.. ما أحلاها وهيَ مُرَّة!
إذْ هيَ الَّتي تُذيقُكَ لَذَّةَ الْمُناجاةِ والتَّضَرُّعِ والدُّعاء)!

ISBN 0-0211-0000-4



نرخی ( ٢٠٠٠ ) دینارە